بسم الله الرحمن الرحيم

# بیروباوەڕی عمر بن عبدالعزیز

-رضي الله عنه-

# لەبارەی قەزا و قەدەر

وەرگێڕانی:

## عبدالإله عبدالعدل

**إنَّ الحَمدَ للّه، نَحمَدُه وَنَستَعينُهُ، مَن يَهده الله فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَن يُضلِل فَلا هادِيَ لَه، وَأَشهَدُ أَنَّ لا إلهَ إلّا الله وَأَشهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبدُهُ وَرَسُولُهُ، أمّا بَعد**[1]**:**

بابەتی قەزا و قەدەر یەکێکە لەو بابەتە عەقیدەییانەی کە هەر زوو لە سەردەمی سەلەفی ساڵح -رضي الله عنهم- فیتنەی تێکەوت. بەڵام -بە فەزڵی الله- ئەوکات سەلەفی ساڵح توانیان شوبهەکان بڕەوێننەوە و دڵمان ئاسوودە بکەن.

بۆیەش -بە پشتیوانیی الله- بە پێویستم زانی لەمبارەیەوە پەیامی ئەمیری موسڵمانان "عمر بن عبد العزیز" -رضي الله عنە- وەربگێڕم بۆ حەق خوازان؛ چونکە ئێمە هەردەم دەڵێین: **قورئان و سوننەت بە فەهمی سەلەفی ئوممەت.**

**ئەم پەیامە لە ٥ بەش پێکهاتووە:** لە بەشی یەکەمدا بەکورتیی هەڵساوم بە ناساندنی ئەمیری موسڵمانان. لە بەشی دووەمیش دەقی پەیامەکەیم وەرگێڕاوە لەگەڵ شیکردنەوەی چەند برگەیەک. لە بەشی سێیەمیش هەڵساوم بە نووسینی کۆمەڵێک لە ئەنجام و سوودەکانی ئەم پەیامە بەشێوەی خاڵ.

---

(١) ئەم ڕستەیە ناسراوە بە "خطبة الحاجة"، پێغەمبەرمان -صلى الله عليه وسلم- ئەمەی فەرمووە لە دەستپێکی وتارەکانی، بگەڕێوە بۆ کتێبی صحيح مسلم > كتاب الجمعة > باب تخفيف الصلاة والخطبة > فەرموودەی ژمارە: ٨٦٨.

لەبەشی چوارەمیش باسی گفتوگۆیەکم کردووە لەنێوان ئەمیری موسڵمانان لەگەڵ قەدەرییەک. لە بەشی پێنجەمیش بەپوختیی باسی **"تەوحید"** م کردووە؛ چونکە هیچ عیلم و عیبادەتێک سوودی بۆ خاوەنەکەی نابێ ئەگەر پەروەردگاری تەوحید نەکردبێت.

داواکارم لە الله، ئەم کتێبە بکاتە تووێشووی قیامەتم، هەروەها بیکاتە مایەی سوود بۆ خوێنەران و حەق خوازان، أللهُمَّ آمین.

**عبدالإله عبدالعدل**
**٣٠/جمادي الأولى/١٤٤٠**

## ناساندنی ئەمیری موسڵمانان عمر بن عبدالعزیز

ئیمامی شمس الدين الذهبي التركماني -رحمه الله- له کتێبی "سير أعلام النبلاء"، له بەرگی پێنجەم، له لاپەڕەی ژماره ١١٤ بەلاوه بەدرێژیی باسی ژیاننامەی ئەمیری موسڵمانان عمر بن عبدالعزیز دەکات -رضي الله عنه-، منیش بەشێکی وەردەگێڕم لەگەڵ زیادکردن و کەمکردن بەپێی پێویست:

کەڵەپیاوی ئوممەتەکەمان و زانای خۆشەویستمان و خەلیفەی موسڵمانان، ئیمامی "أبو حفص" ناوی بریتییه له: عمر بن عبد العزيز بن مروان بن الحكم بن أبي العاص بن أمية بن عبد شمس بن عبد مناف بن قصي بن كلاب، -رضي الله عنه وأرضاه.

سەرچاوەکان جیاوازن له بەرواری له دایکبوونی عمر بن عبد العزیز، هەندێکیان دەڵێن له ساڵی ٦٠ ی هیجریی له دایک بووە، هەندێکیش دەڵێن ٦١، هەندێکیش دەڵێن ٦٣.

الفلاس دەڵێت: گوێم لێبوو الخريبي -رضي الله عنهما- دەیگووت: ئەمانه له هەمان ساڵی شەهیدکردنی ئیمامی حسین لەدایک بوون: الأعمش، هەروەها هشام بن عروة،

هەروەها عمر بن عبد العزيز، هەروەها طلحة بن يحيى. -رضي الله عنهم أجمعين. (کەواتە ساڵی ٦١). والله أعلم.

لە تەمەنی ٢٦ ساڵیدا کرایە والی شاری مەدینە بە فەرمانی خەلیفە الوليد بن عبد الملك -رضي الله عنه. (واتە ساڵی ٨٧ ی هیجریی).

هاوەڵی پایەدار "أنس بن مالك" -رضي الله عنه- لەبارەیەوە دەڵێت: لەدوای مردنی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- هیچ پێشنوێژێکم نەبینیوە کە نوێژکردنی هێندە لە پێغەمبەر بچێت جگە لەم پێشنوێژە (واتە عمر بن عبد العزيز).

لە ساڵی ٩٣ ی هیجریی بەرپرسیارێتییەکەی لێسەندرایەوە؛ چونکە پەیامی ناردبوو بۆ خەلیفەی موسڵمانان، باسی ستەمی "حجاج" ی کردبوو لە بەرامبەر خەڵکی عیراق، داوای لە خەلیفە کردبوو هەڵوێستی هەبێت، بەڵام "حجاج" توانیبووی خەلیفەی موسڵمانان ڕازی بکات تاکو بمێنێتەوە، تەنانەت دوو کەسی نارد بۆ لای خەلیفە؛ تاکو خەلیفەی موسڵمانان بیانکات بە والی شاری مەککە و مەدینە! خەلیفەی موسڵمانانیش جێبەجێی کرد و "عمر بن عبد العزيز" ی لابرد.

لەدوای مردنی خەلیفەی موسڵمانان، ئیتر "سليمان بن عبد الملك" -رضي الله عنه- بوو بە خەلیفەی موسڵمانان،

شەوێک بەیەکەوە لەگەڵ "عمر بن عبد العزیز" لە حەج کردن بوون، ئیتر دەنگی هەورەگرمەیەکی بەهێز هات، زراویان چوو، خەلیفە "سلیمان" بە "عمر" ی گووت: ئەی أبا حفص، هیچ شەوێکی ژیانت وەک ئەمشەو بووە؟! ئەویش پێی گووت: ئەی ئەمیری موسڵمانان، ئەمە دەنگی ڕەحمەتی الله یە، ئەی دەبێ دەنگی سزاکەی چۆن بێت؟! (پەنا بە الله).

لە ساڵی ٩٩ ی هیجریی، خەلیفە "سلیمان بن عبد الملك" بە نەخۆشیی مرد، بەر لە مردنی وەسیەتی کرد بەوەی لەدوای ئەو "عمر بن عبد العزیز" ببێتە خەلیفەی موسڵمانان. ئینجا "عمر بن عبد العزیز" گووتی: سوێند بە الله هەرگیز داوای ئەم پێگەیەم لە الله نەکردووە. (داوای نەکردووە چونکە هەستی بە گەورەیی و قورسیی ئەم پێگەیە کردووە، زانیویەتی ئەم پێگەیە لێپرساوێتییەکی گەورەیە لە دونیا و لە قیامەت).

ئینجا نوێژی لەسەر خەلیفەی پێشوو کرد و دەفنی کرد و ناشتی، پاشان چەند ئەسپێکی تایبەت بە خەلیفەی پێشوویان هێنا تاکو سواری ببێت. ئەویش پێی گووتن: ئێستر (مایین) ـەکەی خۆم بەلاوە باشترە.

هەروەها لەبارەی بەڕێوەبردنی ئەم ئوممەتە فەرموویەتی: بەلامەوە خۆشترە یەکەم کەس بمرم، نەک ئەم ئوممەتە بە

غەیری قورئان و سوننەت بەڕێوەببەم، چونکە ئەمەبوو ئێمەی بەرز کردەوە لەکاتێکدا پێشتر هیچ نەبووین.[١]

هەروەها عمر بن أسید دەگێڕێتەوە: ئیمامی "عمر بن عبد العزیز" نەمرد تاکو وایکرد کە پیاو بە پارەیەکی زۆرەوە دەهات و دەیگووت فەرموون ئەم پارەیە بەکاربهێنن، بەڵام کەس پێویستی پێ نەبوو، بۆیەش پیاوەکە بە ناچاریی پارەکەی دەبردەوە و دەڕۆیشت! هەروەها دەڵێت: بەڕاستیی عمر خەڵکی دەوڵەمەند کرد.

هەروەها "فاطمة" ی هاوسەری -رضي الله عنها- دەگێڕێتەوە: چووم بۆ لای عمر، لە شوێنی نوێژکردنەکەی بوو، دەستی لەسەر ڕووخسار و ڕوومەتی بوو، فرمێسکی دەهاتە خوار. گووتم: ئەی ئەمیری موسڵمانان، شتێک ڕوویداوە؟ گووتی: ئەی فاطمة، من وا بوومەتە هەڵگر و لێپرسراوی ئوممەتی محمد -صلی الله علیه وسلم-، تازە بیرم دەکردەوە لەو کەسەی وا ئێستا هەژارە و برسیەتی، هەروەها نەخۆشێکی سەرگەردان، هەروەها کەسێکی بێ جلوبەرگ، هەروەها ستەملێکراوێکی دڵپڕ، هەروەها نامۆیەکی بەندکراو، هەروەها پیرەپیاو. دەزانم پەروەردگارم لێپرسینەوەم لەگەڵ

(١) ئەم پەڕەگرافەم لە کتێبێکی دیکە دەرهێناوە نەک کتێبی "سیر أعلام النبلاء"، کتێبەکەش بریتییە لە: الجامع في عقائد ورسائل أهل السنة والأثر.

دەکات لەبارەیان، هەروەها پێغەمبەریش -صلی الله علیه وسلم- لە ڕۆژی قیامەتدا داکۆکی لە مافیان دەکات، منیش زۆر ترسام لەوەی هیچ بیانووێکم نەبێت لەو ڕۆژەدا، بۆیەش خۆم بۆ نەگیرا و گریام.

مالك بن دینار -رضي الله عنه- دەڵێت: خەڵک بە من دەڵێن دونیانەویست، بەڵام ئەو کەسەی بەڕاستی دونیانەویستە بریتییە لە "عمر بن عبد العزیز"؛ چونکە چێژی دونیای پێدرا بەڵام پشتی لێکرد.

هەروەها کوڕەکەیشی کە ناوی "عبد العزیز" بوو، کاتێک پرسیاریان لێکرد: کاتێک باوکت بوو بە خەلیفەی موسڵمانان، چەند پارەی هەبوو؟ گووتی: ٥٠٠٠٠ (پەنجا هەزار) دیناری هەبوو. گووتیان: ئەی لە ڕۆژی مردنیدا چەند پارەی هەبوو؟ گووتی: تەنها ٢٠٠ دینار!! (کەواتە لەماوەی خەلیفایەتیدا زیادتر لە ٩٠٪ ی پارەی موڵکی خۆی بەخشیوە لە خزمەتی موسڵمانان).

ئەمیری موسڵمانان بەجۆرێک خەمخۆری ئوممەت بوو، تەنانەت "فاطمة" ی هاوسەری بە ناڕاستەوخۆ ڕایگەیاند کە لەدوای ئەوەی عمر بوو بە خەلیفەی موسڵمانان ئیتر هیچ کاتێک بەیەکەوە جووت نەبوونە! هەروەک إبن المبارك -رحمه الله- لە کتێبی "الزهد" باس دەکات: أبي عبیدة سەردانی

فاطمة ی کرد و لێی پرسی: هەندێک شتم پێ ناڵێی لەبارەی عمر؟ ئەویش پێی گووت: لەو کاتەوەی بوو بە خەلیفەی موسڵمانان، بیرم نایەت غوسلی دەرکردبێ بەهۆی لەشگرانیی و ئاو (مني) هاتنەوە.

هەروەها علي بن المديني -رحمه الله- لەبارەیەوە دەڵێت: ئەگەر بینیت پیاوێک "عمر بن عبدالعزیز" ی خۆشدەوێت و چاکەکانی باس دەکات و بڵاوی دەکاتەوە، ئیتر بزانە ئەم کەسە خێرێکی لەپشتە إن شاء الله.(١)

یەکێک لە پارچە شیعرەکانی ئەمە بووە:

**لا خير في عيش امريء لم يكن له　　من الله في دار القرار نصيب**

**فـــإن تعجـب الدنيا أناسا فإنــها　　متــاع قليل، والـزوال قريب**

واتە:

**ئـەوەی لـە دار الـقرار (بەهەشت) بێـبەش بێت ئـەوا ژیانەکەی خـێری تێدا نییە ئەگەرچــی خەڵکێک بە دونیا سەرسامن، لەڕاستیدا کەمە و ئاوابوونـیشی نزیکە**

لە ساڵی ١٠١ ی هیجریی، لە دەوروبەری تەمەنی ٤٠ ساڵیدا مرد، هەروەها ماوەی خیلافەتەکەی نزیکەی ٢ ساڵ و نیوی خایاند. -رضي الله عنه وأرضاه.

(١) ئەم پەڕەگرافەم لە کتێبێکی دیکە دەرهێناوە نەک کتێبی "سير أعلام النبلاء"، کتێبەکەش بریتییە لە: الجامع في عقائد ورسائل أهل السنة والأثر.

## بیروباوەڕی عمر بن عبدالعزیز لەبارەی قەزا و قەدەر

ئیمامی أبو نعیم الأصبهاني -رحمه الله- له کتێبی "حلية الأولياء وطبقات الأصفياء"، له بەرگی پێنجەم، له لاپەڕی ژمارە ٣٤٦ بەلاوە باسی پەیامی ئەمیری موسڵمانان "عمر بن عبدالعزيز" دەکات -رضي الله عنه- کەوا فەرموویەتی:

**عن كتاب عمر بن عبد العزيز إلى النفر الذين كتبوا إلي بما لم يكن لهم بحق في رد كتاب الله تعالى، وتكذيبهم بأقداره النافذة في علمه السابق الذي لا حد له إلا إليه، وليس لشيء منه مخرج، وطعنهم في دين الله وسنة رسوله القائمة في أمته.**

---

نووسراوە: «**إلى نفر الذين كتبوا إلي**». کەواتە لە بنەڕەتدا ئەم پەیامە وەڵامێک بووە بۆ کەسانێک لە قەدەرییە موبتەدیعەکان، ئەوان لە سەرەتادا پەیامیان بۆ ئەمیری موسڵمانان (عمر بن عبدالعزیز) ناردووە، ئەویش لەم پەیامەدا وەڵامی داونەتەوە.

ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- باسی خراپیی و خوڕافەی ئەو قەدەرییانە دەکات، هەروەک دەڵێت: «**لم يكن لهم بحق في رد كتاب الله تعالى**»، کەواتە قەدەرییەکان بەم بیروباوەڕە چەوتانەیان دژایەتی کتێبی الله دەکەن و ڕەتی دەکەنەوە.

«**وتكذيبهم بأقداره النافذة في علمه السابق**». واتە: (قەدەرییەکان) هەموو ئەو قەدەرانە بەدرۆ دەخەنەوە کە الله لە ڕابردووەوە بڕیاری لەسەرداوە و دەشبێ ڕووبدەن.

نووسراوە: «**وليس لشيء منه مخرج**». واتە: هیچ شتێک دەرنەچووە لە قەدەری الله.

ئەمەش چونکە یەکێک لە کوفر و خورافەی قەدەرییەکان ئەوەیە دەڵێن: مرۆڤ دەتوانێ لەو قەدەرە دەرچێت کە الله بۆی داناوە! پشتیوان بە الله وەڵامیان دەدرێتەوە.

نووسراوە: «**وطعنهم في دين الله وسنة رسوله**». بەڵێ ئەم بیروباوەڕ و شیرکەی قەدەرییەکان خۆی لەخۆیدا ڕەخنە گرتنە لە ئیسلام، ڕەخنە گرتنە لە سوننەتی نێردراوی الله -صلى الله عليه وسلم-. تەنانەت هەندێکیان بەئاشکرا بە پەروەردگار دەڵێن "زاڵم"!!! -پەنا بە الله-.

**أما بعد: فإنكم كتبتم إلي بما كنتم تسترون منه قبل اليوم في رد علم الله والخروج منه إلى ما كان رسول الله -صلى الله عليه وسلم- يتخوف على أمته من التكذيب بالقدر.**

---

نووسراوە: «**فإنكم كتبتم إلي بما كنتم تسترون منه قبل اليوم في رد علم الله**». واتە: ئێوە ئەو شتەتان بۆم نووسیوە کەوا لەوەوپێش شاردبووتانەوە، کە بریتییە لە ڕەت کردنەوەی عیلم و زانستی الله.

بەڵێ ئەمە یەکێکە لە فیتنەی قەدەرییەکان کە پێیان وایە الله زانستی نییە بەوەی لە داهاتوو ڕوودەدات! -پەنا بە الله-، لە لاپەڕەکانی داهاتوودا ئەمیری موسڵمانان وەڵامیان دەداتەوە.

نووسراوە: «**والخروج منه إلى ما كان رسول الله -صلى الله عليه وسلم- يتخوف على أمته من التكذيب بالقدر**». واتە: ئێوە دەرچوونە لەوەی ئیمان بهێنن بە قەدەر، ئیتر چوونەتە ئەو حاڵەتەی کە نێردراوی الله -صلى الله عليه وسلم- لێی دەترسا، کە بریتییە لە ڕەتکردنەوە و بەدرۆ خستنەوەی قەدەر!

من (عبدالإله عبدلعدل) دەڵێم: بەڵێ هەروەک نێردراوی الله فەرموویی: «**إن مجوس هذه الأمة المكذبون بأقدار الله ...**»[1]. واتە: «**بەڕاستیی مەجوسی ئەم ئوممەتە بریتین لەو کەسانەی کە قەدەرەکانی الله بەدرۆ دەخەنەوە ...**».

پێیان گووترا "مجوس"؛ چونکە مەجوسییەکان باوەڕیان بە دوو خودا هەیە! یەکێکیان خودای خێرە، ئەوەی تریش خودای شەڕە! بەهەمان شێوە قەدەرییەکان دەڵێن: کارە خێرەکان لەدەستی الله یە، کارە شەڕەکانیش لەدەست خۆمانە!

(١) کتێبی سنن إبن ماجة > المقدمة > باب في القدر > فەرموودەی ژمارە: ٩٢.

**وقد علمتم أن أهل السنة كانوا يقولون: الاعتصام بالسنة نجاة، وسيقبض العلم قبضا سريعا.**

---

نووسراوە: «**وقد علمتم أن أهل السنة كانوا يقولون: الإعتصام بالسنة نجاة، وسيقبض العلم قبضا سريعا**». لێرەدا ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- بەڵگەی گوفتاری زانایانی سەلەف دەهێنێتەوە بۆ قەدەرییەکان؛ بۆ ئەوەی وازبهێنن لە بیدعەکەیان، ئیتر ملکەچی سوننەت ببن و موناقەشەی ئایاتەکان نەکەن!

ئەمە هەمان گوفتاری ئیمامی الزهري یە -رحمه الله- کاتێک گووتی: «**كان من مضى من علمائنا يقولون: الإعتصام بالسنة نجاة، والعلم يقبض قبضا سريعا، فنعش العلم ثبات الدين والدنيا، وفي ذهاب العلم ذهاب ذلك كله**»[1].

واتە: «**زانایانی پێشینمان دەیانگووت: دەستگرتن بە سوننەت دەبێتە هۆی ڕزگاربوون، زانستیش کەم دەبێتەوە بە خێرایی، بۆیەش بەردەوام بوون و پابەند بوون لە دینداریی دەبێتە مایەی دامەزرانی دین و دونیا، بە دابڕانی دینیش هەمووی دەفەوتێن**».

---

(١) کتێبی سنن الدارمي > المقدمة > باب إتباع السنة > فەرموودەی ژمارە: ٩٧.

**وقول عمر بن الخطاب وهو يعظ الناس: إنه لا عذر لأحد عند الله بعد البينة بضلالة ركبها حسبها هدى، ولا في هدى تركه حسبه ضلالة، قد تبينت الأمور، وثبتت الحجة، وانقطع العذر.**

---

پاشان گوفتارێکی دڵتەزێنی ئیمام "عمر بن الخطاب" باس دەکات –رضي الله عنه– کاتێک فەرموویەتی: «**إنه لا عذر لأحد عند الله بعد البينة بضلالة ركبها حسبها هدى، ولا في هدى تركه حسبه ضلالة، قد تبينت الأمور، وثبتت الحجة، وانقطع العذر**».

واتە: لەدوای ئەوەی حەق ڕوون بوویەوە ئیتر هیچ بیانووێک نییە لەلای الله بۆ هیچ کەسێک کەوا شوێنی گومڕاییەک کەوتبێ و بە حیسابی خۆی وابزانێ لەسەر هیدایەتە، یاخود وازی هێنابێ لە هیدایەت و حەقێک، بە حیسابی خۆی وابزانێ گومڕاییە. ئیتر بابەتەکان ڕوون بوونەتەوە و بەڵگەکان چەسپاون و بیانوو نەماوە.

منیش (عبدالإله عبدلعدل) دەڵێم: هاوار بۆ حاڵی ئێمە، ئیمامی عمر لە سەردەمێکدا ئەو قسەیەی کرد کە هێشتا قورئان و سوننەت کۆنەکرابووەوە و هێشتا بەشێکی خەڵکەکە بێ ئاگا بوون!! کەچی لە سەردەمی ئێمەدا مزگەوت و کتێبخانەکان پڕن لە قورئانی پیرۆز، ئەسڵەن لە هەموو ماڵێک قورئانێکـــــی

لێیه! کەواتە هیچ عوزرێک بۆ خەڵکی ئەم زەمانە نییە ئەگەر بکەونە ناو کوفر و شیرکی گەورە؛ چونکە دەرگای عیلمی شەرعیی کراوەتەوە بەڵام خۆیان نایانەوێ فێربن.

ئەو گوفتارەی ئیمامی عمر بن الخطاب -رضي الله عنه- وەڵامێکە بۆ ئەو مەلا دینفرۆشانەی کە دەڵێن ئەگەر مرۆڤێک بکەوێتە ناو کوفر و شیرکی گەورەش ئەوا کافر نابێت ئەگەر بەهەڵە وایزانیبێ ئەو کارەی حەقە و هیدایەتە!

پەروەردگاریش فەرموویەتی: **{قل هل ننبئكم بالأخسرين أعمالا * الذين ضل سعيهم في الحياة الدنيا وهم يحسبون أنهم يحسنون صنعا}**[1]. واتە: **{-ئەی محمد- پێیان بڵێ: ئایا ئاگادارتان بکەمەوە لەوەی کێن ئەوانەی دۆڕاوترینن لەڕووی کارکردن؟ * ئەو کەسانەن کەوا هەموو کردەوە و کۆششەکانی دونیایان پووچەڵ بووەتەوە لەکاتێکدا وادەزانن خەریکی ئەنجامدانی کارێکی چاکن}**.

کەواتە نیەتی دڵ هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێت و نابێتە هۆی دەرباز بوونی خاوەنەکەی ئەگەر لەسەر بیروباوەڕێکی چەوت و کوفر بێت و واشبزانێت لەسەر حەقە!

(١) سورەتی الكهف، ئایەی ١٠٣ و ١٠٤.

**فمن رغب عن أنباء النبوة وما جاء به الكتاب تقطعت من يديه أسباب الهدى، ولم يجد له عصمة ينجو بها من الردى.**

---

هەروەک ئەمیری موسڵمانان دەڵێت: «**فمن رغب عن أنباء النبوة وما جاء به الكتاب تقطعت من يديه أسباب الهدى، ولم يجد له عصمة ينجو بها من الردى**». واتە: جا هەر کەسێک پشت بکات لە هەواڵەکانی پێغەمبەر و کتێب (واتە قورئان) ئەوا ئیتر خۆی دابڕاند لە سەرچاوە و هۆکارەکانی هیدایەت، ئیتر هیچ پارێزەرێک نییە ڕزگاری بکات لە تیاچوون (سزای ئاگر).

**وإنكم ذكرتم أنه بلغكم أني أقول: إن الله قد علم ما العباد عاملون، وإلى ما هم صائرون، فأنكرتم ذلك علي وقلتم: إنه ليس يكون ذلك من الله في علم حتى يكون ذاك من الخلق عملا. فكيف ذلك كما قلتم؟ والله تعالى يقول: {إنا كاشفوا العذاب قليلا إنكم عائدون}[1]. يعني: عائدين إلى كفر.**

---

وادیاره ئەمیری موسڵمانان لەوەوپێش گووتوویەتی: «**إن الله قد علم ما العباد عاملون، وإلى ما هم صائرون**». واتە: الله لە ڕابردووەوە دەزانێت عەبدەکانی چیدەکەن و چارەنووسیان بەرەو چییە.

بێگومان هەر ئەمەش عەقیدەی سەلەفی ساڵحە، بەڵگەش لەناو قورئانە، کەچی وادیارە قەدەرییە مەجوسییەکان ئەم عەقیدەیە ڕەت دەکەنەوە، هەروەک عمر بن عبدالعزيز -رضي الله عنه- دەڵێت: «**فأنكرتم ذلك علي وقلتم: إنه ليس يكون ذلك من الله في علم حتى يكون ذاك من الخلق عملا**». واتە: ئێوە ئەم عەقیدەیەی منتان ڕەت کردووەتەوە و پێتان وایە الله توانای زانینی ئەو کارەی نییە تاوەکو مرۆڤەکان کردەوە نەکەن!

(١) سورەتی الدخان، ئایەی ١٥.

لێرەدا ئەمیری موسڵمانان وەڵامی ئەو شوبهەیەیان دەداتەوە و دەڵێت: «**فكيف ذلك كما قلتم؟ والله تعالى يقول: {إنا كاشفوا العذاب قليلا إنكم عائدون}. يعني: عائدين إلى كفر**».

واتە: چۆن بابەتەکە بەوجۆرەیە کە ئێوە دەیڵێن لەکاتێکدا الله -تعالی- دەڵێت: {**بێگومان ئێمە ئەگەر تۆزێکیش سزاتان لەسەر لابەرین ئەوا (دەردەکەوێ) ئێوە دەگەڕێنەوە سەری**}، واتە: دەگەڕێنەوە سەر کوفر.

ئەمە وەڵامێکی بەهێزە بۆ درۆی قەدەرییەکان، دەیسەلمێنێ الله توانای زانینی داهاتوویشی هەیە ئەگەرچی هێشتا مرۆڤەکان هیچ کردەوەیان نەکردبێت.

**وقال تعالى: {ولو ردوا لعادوا لما نهوا عنه وإنهم لكاذبون}[1]، فزعمتم بجهلكم في قول الله تعالى: {فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر}[2] أن المشيئة في أي ذلك أحببتم فعلتم من ضلالة أو هدى، والله تعالى يقول: {وما تشاءون إلا أن يشاء الله رب العالمين}[3].**

---

نووسراوە: «**وقال تعالى: {ولو ردوا لعادوا لما نهوا عنه وإنهم لكاذبون}**». ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی الله زانستی داهاتووی هەیە بەر لەوەی هیچ شتێک ڕووبدات، ئایەتەکەش واتە: **{ئەگەر بگەڕێندرێنەوە (بۆ دونیا) ئەوا دیسان دەستیان دەکردەوە بەو شتانەی لێیان حەڕام کرابوو، بەڕاستیی ئەوان درۆزنن}**.

ئینجا ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- پێیان دەڵێت: «**فزعمتم بجهلكم في قول الله تعالى: {فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر} أن المشيئة في أي ذلك أحببتم فعلتم من ضلالة أو هدى**». واتە: ئێوە بە جاهیلێتی خۆتان لێکدانەوەتان بۆ ئەم ئایەتە کردووە کە الله -تعالى- فەرموویەتی: **{هەر کەسێک ویستی با ئیمان بهێنێ، هەر کەسیش ویستی با کوفر بکات}**،

---

(١) سورەتی الأنعام، ئایەی ٢٨.

(٢) سورەتی الكهف، ئایەی ٢٩.

(٣) سورەتی التكوير، ئایەی ٢٩.

بەهۆی ئەم ئایەتە ئێوە پێتان وایە هیدایەت و گومڕایی لەدەست خۆتانە و بە حەزی خۆتانە.

ئینجا وەڵامیان دەداتەوە، وەک نووسراوە: «**والله -تعالى- يقول: {وما تشاءون إلا أن يشاء الله رب العالمين}**». واتە: الله -تعالى- فەرموویەتی: **{ئێوە ناتوانن ویستی هیچ شتێکتان هەبێت مەگەر الله ی پەروەردگاری جیهانەکان ویستی لێبێ}**.

**فبمشيئة الله لهم شاءوا ولو لم يشأ لم ينالوا بمشيئتهم من طاعته شيئا قولا ولا عملا، لأن الله تعالى لم يملك العباد ما بيده، ولم يفوض إليهم ما يمنعه من رسله.**

---

ئینجا ئایەتەکەیان بۆ شیدەکاتەوە و دەڵێت: «**فبمشيئة الله لهم شاءوا ولو لم يشأ لم ينالوا بمشيئتهم من طاعته شيئا قولا ولا عملا**». واتە: مرۆڤەکان ئەو کاتە دەتوانن ویستێکیان هەبێت ئەگەر الله سەرەتا ویستی لێبێ بۆیان، خۆ ئەگەر الله ویستی لێ نەبێت ئەوا مرۆڤەکان ویستی هیدایەتیان بۆ دروست نابێت جا ئەگەر بە کردەوەیەک یاخود قسەیەکیش بێت.

هەروەها نووسراوە: «**لأن الله تعالى لم يملك العباد ما بيده، ولم يفوض إليهم ما يمنعه من رسله**». واتە: ئەمەش چونکە الله -تعالى- ئەم توانا و موڵکەی نەداوەتە عەبدەکان کە خۆی هەیەتی، هەروەها ئەو کارەی نەگەڕاندووەتەوە دەست عەبدەکان لەکاتێکدا پێغەمبەرانیشی لەمە قەدەغە کردووە.

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ ئەو کەسانەی پێیان وایە هیدایەت لەدەست خۆمانە و هەر کاتێک بمانەوێت دەتوانین ببین بە موەحید و ئیماندار و ئەهلی حەق! ئەگەر بشمانەوێ ئەوا دەتوانین بگەڕێینەوە نێـو

کوفر و شیرک! لەڕاستیدا مرۆڤ توانای هیدایەت و گومڕاکردنی خۆیشی نییە ئەگەر پێشوەختە الله ویستی لێ نەبێت. هەر بۆیەش کاتێک کافرانی قەومی شعیب -علیه السلام- بەو پێغەمبەرەیان گووت بگەڕێوە سەر دینی ئێمە، ئەویش فەرمووی: {**... وما يكون لنا أن نعود فيها إلا أن يشاء الله ربنا ...**}[1]، واتە: {**... بۆمان نییە بگەڕێینەوە ناوی (واتە ناو شیرک) تەنها مەگەر الله ی پەروەردگارمان ویستی لێبێ ...**}. چی لەم بەڵگەیە ڕوونترە؟!

هەروەها دەڵێم: مرۆڤەکان بەسەر ٣ کۆمەڵە دابەش دەبن:

١- کۆمەڵەیەکیان هەر بەدوای حەقیش ناگەڕێن و ئاگایان لێی نییە، ئەمەش هەر بە فەرمان و ویستی الله حاڵیان ئاوایە.

٢- کۆمەڵەیەکیش بە فەرمانی الله ئەو هەستەیان هەیە کە بەدوای حەق بگەڕێن، بەڵام هەر بە فەرمانی الله پێی ناگەن.

٣- کۆمەڵەیەکیش بە فەرمانی الله بەدوای حەق دەگەڕێن و هەر بە فەرمانی الله پێی دەگەن، ئەمەش فەزڵێکی الله یە بۆیان، هیچ ئازایەتییەکی خۆیانی تێدا نییە.

(١) سورەتی الأعراف، ئایەی ٨٩.

**فقد حرصت الرسل على هدى الناس جميعا، فما اهتدى منهم إلا من هداه الله، ولقد حرص إبليس على ضلالتهم جميعا، فما ضل منهم إلا من كان في علم الله ضالا.**

---

ئینجا ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- نموونە دەهێنێتەوە و دەڵێت: «**فقد حرصت الرسل على هدى الناس جميعا، فما اهتدى منهم إلا من هداه الله**». واتە: پێغەمبەران سوور بوون لەسەر هیدایەت دانی هەموو خەڵک، بەڵام هەموو خەڵکەکە هیدایەتیان وەرنەگرت جگە لەوانە نەبێت کە الله هیدایەتیانی دا.

هەروەها دەڵێت: «**ولقد حرص إبليس على ضلالتهم جميعا، فما ضل منهم إلا من كان في علم الله ضالا**». واتە: بەهەمان شێوە ئیبلیس سوور بوو لەسەر گومڕا کردنی هەموو خەڵک، بەڵام هەموو خەڵکەکە گومڕا نەبوون تەنها ئەوانە نەبێ کە لە زانستی الله بە گومڕا تۆمار کرابوون.

**وزعمتم بجهلكم أن علم الله تعالى ليس بالذي يضطر العباد إلى ما عملوا من معصيته، ولا بالذي صدهم عما تركوه من طاعته، ولكنه بزعمكم كما علم الله أنهم سيعملون بمعصيته، كذلك علم أنهم سيستطيعون تركها، فجعلتم علم الله لغوا.**

---

ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- باسی بیروباوەڕی چەوتی قەدەرییەکان دەکات (بۆ ئەوەی خۆمان بپارێزین و هاوبیریان نەبین)، هەروەک دەڵێ: «**وزعمتم بجهلكم أن علم الله تعالى ليس بالذي يضطر العباد إلى ما عملوا من معصيته، ولا بالذي صدهم عما تركوه من طاعته**». واتە: ئێوە بە جاهیلێتی خۆتان پێتان وایە زانستی الله بەو جۆرە نییە کە مرۆڤەکان ناچار بکات بە ئەنجامدانی تاوان، یاخود هانیان بدات بەرەو وازهێنان لە عیبادەتی خۆی.

بەڵکو لەلای قەدەرییەکاندا توانای زانینی الله ئاوایە: «**ولكنه بزعمكم كما علم الله أنهم سيعملون بمعصيته، كذلك علم أنهم سيستطيعون تركها**». واتە: بەڵکو ئێوە (قەدەرییەکان) پێتان وایە هەروەک چۆن الله دەزانێت مرۆڤەکان لە داهاتوو تاوانێک دەکەن، ئاواش دەزانێت ئەو مرۆڤانە دەتوانن تەرکی بکەن و نەیکەن!

لە وەڵامیشدا ئەمیری موسڵمانان پێیان دەڵێت: «**فجعلتم علم الله لغوا**». واتە: کەواتە ئێوە توانای زانینی الله ـتان کردووەتە شتێکی پڕوپووچ و بێسوود و گاڵتە!

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: بەڵێ قەدەرییەکان بەم بیروباوەڕە پیسەیان گاڵتە بە توانای زانینی الله دەکەن؛ چونکە (بۆ نموونە) دەڵێن: لەوانەیە مرۆڤێک لەلای الله ڕێگریی لێکرابێت لەوەی تاوانێک بکات، بەڵام هەر لەلای الله ڕێگای پێدراوە تاوانەکە بکات!! ئۆف لەم کوفر و گاڵتەجاڕیی و جەهلە!

**تقولون لو شاء العبد لعمل بطاعة الله، وإن كان في علم الله أنه غير عامل بها، ولو شاء ترك معصيته وإن كان في علم الله أنه غير تارك لها، فأنتم إذا شئتم أصبتموه وكان علما، وإذا شئتم رددتموه وكان جهلا، وإن شئتم أحدثتم من أنفسكم علما ليس في علم الله وقطعتم به علم الله عنكم.**

---

ئینجا ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- بەردەوام دەبێت لە ئابڕوو بردنی قەدەرییەکان، دەڵێت: «**تقولون لو شاء العبد لعمل بطاعة الله، وإن كان في علم الله أنه غير عامل بها، ولو شاء ترك معصيته وإن كان في علم الله أنه غير تارك لها**». واتە: ئێوە (قەدەرییەکان) دەڵێن ئەگەر مرۆڤەکان بیانەوێت ئەوا دەتوانن گوێڕایەڵی الله ببن ئەگەرچی لە زانستی الله وا نووسرابێت کە نەتوانن گوێڕایەڵ بن! هەروەها مرۆڤەکە دەتوانێت تاوانێک نەکات ئەگەرچی لە زانستی الله وا نووسرابێت کە ئیللا تاوانەکەی بکات!

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: کەوابێ قەدەرییە مولحیدەکان پێیان وایە قەدەری ڕاستەقینە لە ژێر دەستی خۆیانە نەک لەدەستی الله!، بەمەش هیچ مانایەک نەمایەوە بۆ توانای قەدەری الله. -پەنا بە الله.

نووسراوە: «**فأنتم إذا شئتم أصبتموه وكان علما، وإذا شئتم رددتموه وكان جهلا**». واتە: کەوابێ ئێوە (قەدەرییەکان) پێتان وایە ئەگەر بتانەوێت ئەوا دەتوانن هاوشێوەی قەدەری الله بجووڵێنەوە، ئەگەریش بتانەوێت ئەوا دەتوانن قەدەری الله ڕەت بکەنەوە!

هەروەها پێیان دەڵێت: «**وإن شئتم أحدثتم من أنفسكم علما ليس في علم الله وقطعتم به علم الله عنكم**». واتە: ئێوە (قەدەرییەکان) پێتان وایە ئەگەر بتانەوێت ئەوا دەتوانن کردەوەیەک بکەن بەبێ ئەوەی کردەوەکە لە زانستی الله بوونی هەبێت! بەمەش توانای زانستی الله ـتان لەخۆتان پچڕاند.

**وهذا ما كان ابن عباس يعده للتوحيد نقضا، وكان يقول: إن الله لم يجعل فضله ورحمته هملا بغير قسم منه ولا اختيار، ولم يبعث رسله بإبطال ما كان في سابق علمه.**

---

ئینجا ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- باسی تێگەیشتنی هاوەڵی خۆشەویست "إبن عباس" دەكات -رضي الله عنهما-، هەروەک نووسراوە: «**وهذا ما كان ابن عباس يعده للتوحيد نقضا**». واتە: ئەم بیروباوەڕە لەلای إبن عباس بریتییە لە هەڵوەشێنەری تەوحید. (واتە خاوەنەكە كافر بووە).

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: بەڵێ لەم بارەیەوە بەڵگەمان بۆ ماوەتەوە لە إبن عباس -رضي الله عنهما- كاتێک دەڵێت: «**الإيمان بالقدر نظام التوحيد، فمن آمن وكذب بالقدر فهو نقض للتوحيد**»[1]. واتە: «**ئیمان هێنان بە قەدەر بریتییە لە كۆڵەگەی[2] تەوحید، جا هەر كەسێک ئیمانی هێنابێت بەڵام قەدەر ڕەتبكاتەوە ئەوا ئەو كارەی بریتییە لە هەڵوەشێنەری تەوحید**».

---

(١) كتێبی السنة لعبدالله بن أحمد بن حنبل -رحمهما الله- > فەرموودەی ژمارە: ٩٢٥.

(٢) كۆڵەگە: واتە وەستێنەر، یاخود ستوون، هەروەک دەگووترێ: كۆڵەگەی پشت، واتە بڕبڕەی پشت. بگەڕێوە بۆ فەرهەنگی: هەنبانە بۆرینە > پیتی "ک" > لاپەڕەی ژمارە: ٦٤٢ > ستوونی لای چەپ.

جا هەروەک چۆن مرۆڤ بەبێ بڕبڕەكانی پشتی ناتوانێت بووەستێت، ئاواش مرۆڤ ناتوانێ ئیماندار بێت ئەگەر باوەڕی بە قەدەر نەبێت.

هەروەها ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- گوفتارێکی تری إبن عباس دەگێڕێتەوە، هەروەک نووسراوە: «**وكان يقول: إن الله لم يجعل فضله ورحمته هملا بغير قسم منه ولا اختيار، ولم يبعث رسله بإبطال ما كان في سابق علمه**». واتە: إبن عباس دەیگووت: الله فەزڵ و ڕەحمەتەکەی پشتگوێ نەخستووە بەوەی مرۆڤەکان دەست نیشان نەکات و نەیدات بە کەسیان، هەروەها پێغەمبەرانیشی نەناردووە بۆ ئەوەی زانستە بنەڕەتەکەی خۆی ڕەت بکاتەوە.

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: گوفتارەکەی إبن عباس وەڵامی تێدایە بۆ قەدەرییەکان؛ چونکە ئەگەر بەپێی قسەی ئەوان بێت ئەوا هیچ مانایەک نەماوەتەوە بۆ توانا و قەدەری الله، هەروەها ئەو ئایاتانەش ڕەت دەکرێنەوە کە الله باسی فەزڵەکانی خۆی دەکات کە داویەتی بە هەندێک لە عەبدەکان! هەروەها بەلای ئەوانەوە الله بەهۆی ناردنی پێغەمبەرانەوە ئیتر قەدەری خۆی ڕەت دەکاتەوە! چونکە لەوانەیە لەلای الله کەسێک بە گومڕا تۆمار کرابێت، بەڵام ئەو کەسە بەهۆی پێغەمبەرێکەوە هیدایەت دەدرێت!! -پەنا بە الله لەم بیروباوەڕە.

**فأنتم تقرون في العلم بأمر وتنقضونه في آخر، والله تعالى يقول: {يعلم ما بين أيديهم وما خلفهم ولا يحيطون بشيء من علمه إلا بما شاء}[1]، فالخلق صائرون إلى علم الله تعالى، ونازلون عليه، وليس بينه شيء هو كائن حجاب يحجبه عنه، ولا يحول دونه، إنه عليم حكيم.**

---

ئیتر ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- پێیان دەڵێت: «**فأنتم تقرون في العلم بأمر وتنقضونه في آخر، والله تعالى يقول: {يعلم ما بين أيديهم وما خلفهم ولا يحيطون بشيء من علمه إلا بما شاء}**». واتە: ئێوە لە ڕوویەکەوە دان دەنێن بە عیلم و قەدەری الله، لە ڕوویەکی تریشەوە بەدرۆی دەخەنەوە و هەڵیدەوەشێننەوە. کەچی الله -تعالى- دەفەرمووێ: **{الله ئاگاداری حاڵی ئێستایانە و ئاگاداری دواوەیانە (واتە ڕۆژی دوایی) هەروەها ئەوان توانایان نییە بگەن بە هیچ بەشێک لە عیلمی ئەو تەنها ئەوە نەبێت کە خۆی ویستی لێیەتی}**.

نووسراوە: «**فالخلق صائرون إلى علم الله تعالى، ونازلون عليه، وليس بينه شيء هو كائن حجاب يحجبه عنه، ولا يحول دونه، إنه عليم حكيم**». واتە: کەواتە بوونەوەرەکـــــان

---

(١) سورەتی البقرة، ئایەی ٢٥٥.

خەریکن عیلم و قەدەری الله جێبەجێ دەکەن، هیچ کەسیش ناتوانێ ببێتە بەربەست و ڕێگر لەبەردەم جێبەجێ بوونی قەدەرەکەی، هەروەها توانای گۆڕانی قەدەریشی نییە، بەڕاستیی ئەویش (الله) زانایە و دانایە.

**وقلتم: لو شاء الله لم يفرض بعمل بغير ما أخبر الله في كتابه عن قوم: {ولهم أعمال من دون ذلك هم لها عاملون}[1]، وأنه قال: {سنمتعهم قليلا ثم يمسهم منا عذاب أليم}[2]، فأخبر أنهم عاملون قبل أن يعملوا، وأخبر أنه معذبهم قبل أن يخلقوا.**

---

وادیاره قەدەرییەکان بیروباوەڕیان هێندە بۆگەن بووە کە گووتوویانە: ئەگەر الله بیەوێت ئەوا دەتوانێت هەواڵەکانی ناو قورئانیش بگۆڕێت بۆ شتی تر!

هەروەک ئەمیری موسڵمانان باسیان دەکات: «**وقلتم: لو شاء الله لم يفرض بعمل بغير ما أخبر الله في كتابه عن قوم: {ولهم أعمال من دون ذلك هم لها عاملون}**». واتە: ئێوە (قەدەرییەکان) پێتان وایە ئەگەر الله بیویستایە ئەوا ئەو کارانەی لەسەر قەومەکە فەرز نەدەکرد کەوا لەم ئایەتە باسی کردووە: **{کۆمەڵێک کاری تریشیان هەیە جگە لەمانە کەوا ئەنجامیان دەدەن}**. جا ئەگەر الله بیویستایە ئەوا دەیتوانی نەهێڵێت ئەو کارانە بکەن.

(١) سورەتی المؤمنون، ئایەی ٦٣.

(٢) سورەتی هود، ئایەی ٤٨.

ئەمیری موسڵمانان بە ئایەت وەڵامیان دەداتەوە: «**وأنه قال: {سنمتعهم قليلا ثم يمسهم منا عذاب أليم}، فأخبر أنهم عاملون قبل أن يعملوا، وأخبر أنه معذبهم قبل أن يخلقوا**».

واتە: الله فەرموویەتی: {**کەمێک بە چێژ و خۆشیی بەردەوامیان دەکەین پاشانیش لەلایەن ئێمەوە سزایەکی بەئێشیان بەردەکەوێ**}. ئەوەتا الله پێمان دەڵێت ئەوان کارێک دەکەن ئەگەرچی هێشتا نەیانکردووە، هەروەها سزایشیان دەدات ئەگەرچی هێشتا دروستیشی نەکردوون.

**وتقولون أنتم إنهم لو شاءوا خرجوا من علم الله في عذابه إلى ما لم يعلم من رحمته لهم، ومن زعم ذلك فقد عادى كتاب الله برد، ولقد سمى الله تعالى رجالا من الرسل بأسمائهم وأعمالهم في سابق علمه، فما استطاع آباؤهم لتلك الأسماء تغييرا، وما استطاع إبليس بما سبق لهم في علمه من الفضل تبديلا.**

---

ئینجا ئەمیری موسڵمانان باسی گومانێکی تریان دەکات، هەروەک نووسراوە: «**وتقولون أنتم إنهم لو شاءوا خرجوا من علم الله في عذابه إلى ما لم يعلم من رحمته لهم**». واتە: ئێوە دەڵێن ئەگەر ئەوان (واتە دۆزەخییەکان) بیانویستایە ئەوا دەیانتوانی لەو قەدەرەی الله دەرباز ببن لە حاڵەتی سزاوە بەرەو حاڵەتی ڕەحمەت!

ئینجا وەڵامیان دەداتەوە: «**ومن زعم ذلك فقد عادى كتاب الله برد، ولقد سمى الله تعالى رجالا من الرسل بأسمائهم وأعمالهم في سابق علمه، فما استطاع آباؤهم لتلك الأسماء تغييرا، وما استطاع إبليس بما سبق لهم في علمه من الفضل تبديلا**». واتە: هەر کەسێک ئەم بیروباوەڕەی هەبێت ئەوا دژایەتی کتێبی الله ی کردووە و ڕەتی کردووەتەوە. چونکە ئەوەتا الله لە عیلمی ڕابردووی خۆیدا ناو و کاری پێغەمبەرانی چەسپاندبوو، ئیتر باوک و کەسوکاری پێغەمبەرەکـــــــان

..........................................................

نەیانتوانی تەنانەت ناوی ئەو پێغەمبەرانە بگۆڕن بۆ ناوی تر، هەروەها ئیبلیسیش نەیتوانی ئەو فەزڵە بگۆڕێت کە پێیان درابوو (واتە نەیتوانی هەڵیانگەڕێنێتەوە).

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: تەنانەت الله -سبحانه- هەر لە دونیاوە باسی داهاتووی ئیبلیسمان بۆ دەکات کە چۆن خۆی بێبەری دەکات لە ئەهلی دۆزەخ. ئەمەش لە ئایەتی "إبراهیم:٢٢" باسکراوە.

دەی ئەگەر هیدایەتی بوونەوەرەکان لەدەستی خۆیانە ئەوا بۆچی شەیتان تەنازول ناکات و داوای لێخۆشبوون لە الله ناکات؟ بێگومان ناتوانێت؛ چونکە ئەمە وەعدی پەروەردگارە و هەر دەبێت شەیتان بچێتە دۆزەخ و ئەم گوفتارەش بۆ ئەهلی دۆزەخ پێشکەش بکات.

بەپێی قسەی قەدەرییەکان بێت، کەواتە ئێستا ئیبلیس دەتوانێت ئەم ئایەتەی الله هەڵوەشێنێتەوە و داوای لێخۆشبوون بکات و خۆی ڕزگار بکات لە سزاکەی، -پەنا بە الله.

**فقال: {واذكر عبادنا إبراهيم وإسحاق ويعقوب أولي الأيدي والأبصار * إنا أخلصناهم بخالصة ذكرى الدار}[١].**

---

ئینجا بەڵگەی ئایەتیان بۆ دەهێنن: «**فقال: {واذكر عبادنا إبراهيم وإسحاق ويعقوب أولي الأيدي والأبصار * إنا أخلصناهم بخالصة ذكرى الدار}**». واتە: الله فەرموویەتی: **{-ئەی محمد- باسی هەریەک لە عەبدەکانمان إبراهيم و إسحاق و یعقوب بکە کەوا خاوەنی دەست و بینایی بوون * بەڕاستیی ئێمە ئەوانمان هەڵبژارد بەوەی هەمیشە یادیان لای ماڵەکە بێت (واتە ڕۆژی دوایی)}**.

منیش (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: بەڵگەیەکی تریش ئەوەیە کە پێغەمبەر عیسا -صلى الله عليه وسلم- لە سەردەمی خۆیدا بە قەومەکەی خۆی ڕاگەیاند کە لەدوای ئەودا پێغەمبەرێک دێت بەناوی "أحمد". هەروەک فەرمووی: **{... ومبشرا برسول يأتي من بعدي اسمه أحمد ...}**[٢]. واتە: **{... هەروەها موژدە دەدەم بە نێردراوێک کە لەدوای منەوە دێت ناوی أحمدـە ...}**.

ئەوەتا قسەی پێغەمبەر عیسا هاتەجێ لەکاتێکدا بەر لە هەزاران ساڵ پێش لە دایک بوونی پێغەمبەرمان ئەو قسەیەی

---

(١) سورەتی ص، ئایەی ٤٥ و ٤٦.

(٢) سورەتی الصف، ئایەی ٦.

کردبوو! ئەوەتا قەدەری الله چەسپا، کەس نەیتوانی ببێتە ڕێگر لەبەردەم ناوی پێغەمبەرمان، کەسیش نەیتوانی گومڕای بکات، کەسیش نەیتوانی بیکوژێت.

بەڵگەیەکی تریش بریتییە لە حاڵی ئیبلیس، هەروەک الله پێی فەرموو: {**لأملأن جهنم منك وممن تبعك منهم أجمعين**}[1]. واتە: {**دۆزەخ پڕ دەکەم لە تۆ و ئەوانەیشی (مرۆڤەکان) کە بەدوات دەکەون، هەموویان**}. ئەوەتا ئیبلیس هەر لە سەرەتای مرۆڤایەتییەوە بە گومڕا لەقەڵەمدراوە و ناشتوانێ بگۆڕێ!

بەڵگەیەکی تریش بریتییە لە گوفتاری الله: {**... قل لو كنتم في بيوتكم لبرز الذين كتب عليهم القتل إلى مضاجعهم ...**}[2]. واتە: {**... -ئەی محمد- بڵێ: خۆ ئەگەر ئێوە لەناو ماڵی خۆشتان بوونایە ئەوا الله هەمان ئەوانەی کە کوژرانیان لەسەر نووسرابوو، دەیهێنان و لە شوێنی مردنیان ڕایدەخستن ...**}.

(١) سورەتی ص، ئایەی ٨٥.

(٢) سورەتی آل عمران، ئایەی ١٥٤.

..........................................................

دەتوانم بڵێم ئەم ئایەتە وازحترین بەڵگەیە کە دەیسەلمێنێ مرۆڤەکان توانای گۆڕینی قەدەریان نییە، ئەوەتا الله ڕایگەیاند ئەگەر بیەوێت کەسێک لە مەیدانی جیهاد بکوژرێت ئەوا ئیللا دەیباتە مەیدانەکە و لەوێدا دەیمرێنێت ئەگەرچی مرۆڤەکە خۆی بدزێتەوە یاخود هەوڵبدات ڕابکات و نەچێتە ئەوێ!

**فالله أعز في قدرته، وأمنع من أن يملك أحدا إبطال علمه في شيء من ذلك، فهو مسمى لهم بوحيه الذي لا يأتيه الباطل من بين يديه ولا من خلفه أو أن يشرك في خلقه أحدا، أو يدخل في رحمته من قد أخرجه منها، أو أن يخرج منها من قد أدخله فيها.**

---

ئینجا پێیان دەڵێت: «**فالله أعز في قدرته، وأمنع من أن يملك أحدا إبطال علمه في شيء من ذلك، فهو مسمى لهم بوحيه الذي لا يأتيه الباطل من بين يديه ولا من خلفه أو أن يشرك في خلقه أحدا، أو يدخل في رحمته من قد أخرجه منها، أو أن يخرج منها من قد أدخله فيها**».

واتە: الله بەهێزە لەڕووی توانا، هەروەها زۆر لەوە زیادتر ڕێگرە لەوەی کەسێک بتوانێت زانست و قەدەرەکەی هەڵوەشێنێتەوە، ئەوەتا بەهۆی وەحییەوە ناوی لە پێغەمبەرەکان ناوە، وەحییەک کەوا هیچ ناحەقێک ناتوانێت لێی نزیک ببێتەوە، یان کەسێک ببێتە هاوبەش لە دروستکراوەکانی، یاخود بتوانێ بچێتە ناو ڕەحمەتی الله لەکاتێکدا الله دەریکردبێ! یاخود دەربچێ لەو ڕەحمەتەی کەوا الله پێیداوە.

ولقد أعظم بالله الجهل من زعم أن العلم كان بعد الخلق، بل لم يزل الله وحده بكل شيء عليما، وعلى كل شيء شهيدا، قبل أن يخلق شيئا، وبعدما خلق لم ينقص علمه في بدئهم، ولم يزد بعد أعمالهم، ولا بحوائجه التي قطع بها دابر ظلمهم، ولا يملك إبليس هدى نفسه، ولا ضلالة غيره، وقد أردتم بقذف مقالتكم إبطال علم الله في خلقه، وإهمال عبادته، وكتاب الله قائم بنقض بدعتكم، وإفراط قذفكم.

---

نووسراوە: «**ولقد أعظم بالله الجهل من زعم أن العلم كان بعد الخلق**». واتە: گەورەترین جەهل بەرامبەر بە الله ئەوەیە کە بگووترێت زانستی الله کەوتووەتە پاش دروستکردنی مرۆڤ نەک لەپێشی!

بەڵام لە ڕاستیدا: «**بل لم يزل الله وحده بكل شيء عليما، وعلى كل شيء شهيدا، قبل أن يخلق شيئا، وبعدما خلق لم ينقص علمه في بدئهم، ولم يزد بعد أعمالهم، ولا بحوائجه التي قطع بها دابر ظلمهم، ولا يملك إبليس هدى نفسه، ولا ضلالة غيره**». واتە: لەڕاستیدا تاکو ئێستاش هەر الله بەتەنها زانستی هەیە بە گشت شتێک، هەروەها ئاگادار و چاودێرە بەسەر هەموو شتێک، بەر لە دروست کردنی هیچ شتێک، هەروەها لەدوای ئەوەی مرۆڤایەتی دروستکرد ئیتر عیلمەکەی

کەمی نەکرد، هەروەها بەهۆی کردەوەی مرۆڤەکانەوە زیادی نەکرد، هەروەها ئیبلیس ناتوانێ هیدایەتی خۆی بدات و ناشتوانێ کەس گومڕا بکات.

ئینجا بە قەدەرییەکان دەڵێت: «**وقد أردتم بقذف مقالتكم إبطال علم الله في خلقه، وإهمال عبادته، وكتاب الله قائم بنقض بدعتكم، وإفراط قذفكم**». واتە: ئێوە بەم بوهتانە دەتانەوێت زانستی الله ڕەتبکەنەوە لەبارەی دروستکراوانی، هەروەها وای پیشان بدەن گوایە بێ ئاگایە لە عەبدەکانی، بەڵام کتێبی الله وەستاوە بۆ بەدرۆخستنەوەی بیدعە و داهێنراوەکەتان و بوهتانە سنووربەزێنەکەتان.

**ولقد علمتم أن الله بعث رسوله والناس يومئذ أهل شرك، فمن أراد الله له الهدى لم تحل ضلالته التي كان فيها دون إرادة الله له، ومن لم يرد الله له الهدى تركه في الكفر ضالا، فكانت ضلالته أولى به من هداه، فزعمتم أن الله أثبت في قلوبكم الطاعة والمعصية، فعملتم بقدرتكم بطاعته، وتركتم بقدرتكم معصيته، وإن الله خلو من أن يكون يختص أحدا برحمته، أو يحجز أحدا عن معصيته.**

---

نووسراوه: «**ولقد علمتم أن الله بعث رسوله والناس يومئذ أهل شرك، فمن أراد الله له الهدى لم تحل ضلالته التي كان فيها دون إرادة الله له، ومن لم يرد الله له الهدى تركه في الكفر ضالا، فكانت ضلالته أولى به من هداه**». واته: ئێوه دەزانن کەوا لەوکاتەی الله نێردراوەکەی نارد ئەوا خەڵکەکە ئەهلی شیرک بوون (موشریک بوون)، جا هەر کەسێک کە الله ویستی هیدایەتی بۆی هەبووبێ ئەوا چیتر نەدەبوو بە گومڕایی بمێنێتەوە دوور لە ویستی الله. هەر کەسێکیش کە الله ویستی گومڕایی بۆی هەبووبێ ئەوا لەناو کوفرەکەی جێی هێشت بە گومڕایی. بەمەش گومڕابوونی کەوتە پێش وەرگرتنی هیدایەت.

ئینجا پێیان دەڵێ: «**فزعمتم أن الله أثبت في قلوبكم الطاعة والمعصية، فعملتم بقدرتكم بطاعته، وتركتم بقدرتكـــــــم**

**معصيته، وإن الله خلو من أن يكون يختص أحدا برحمته، أو يحجز أحدا عن معصيته**». واته: ئێوه پێتان وایه الله لەنێو دڵتاندا گوێڕایەڵیی و سەرپێچیی جێگیر کردووه، بۆیەش بە ویستی خۆتانە کە گوێڕایەڵی ئەو دەبن، هەروەها بە ویستی خۆتانە کە سەرپێچی دەکەن! هەروەها الله هەرگیز مرۆڤێک نیشان ناکات بەوەی ڕەحمەتی خۆی بەسەر ببارێنێت، هەروەها مرۆڤێک نیشان ناکات بەوەی دووری بخاتەوە لە تاوانکردن!

**وزعمتم أن الشيء الذي بقدر إنما هو عندكم اليسر والرخاء والنعمة، وأخرجتم منه الأعمال، وأنكرتم أن يكون سبق لأحد من الله ضلالة أو هدى، وأنكم الذين هديتم أنفسكم من دون الله، وأنكم الذين حجزتموها عن المعصية بغير قوة من الله، ولا إذن منه.**

---

هەروەها پێیان دەڵێت: «**وزعمتم أن الشيء الذي بقدر إنما هو عندكم اليسر والرخاء والنعمة، وأخرجتم منه الأعمال**». واتە: ئێوە پێتان وایە قەدەری الله تەنها بریتییە لەوەی الله کارتان بۆ ئاسان دەکات و ناز و نیعمەتتان پێدەدات، بەڵام بابەتی کردار لەلای ئێوە هیچ پەیوەندیی نییە بە قەدەر!

هەروەها دەڵێت: «**وأنكرتم أن يكون سبق لأحد من الله ضلالة أو هدى، وأنكم الذين هديتم أنفسكم من دون الله، وأنكم الذين حجزتموها عن المعصية بغير قوة من الله، ولا إذن منه**». واتە: ئێوە (قەدەرییەکان) ڕەتی دەکەنەوە کە پێشوەختە لە زانستی الله دا کەسێک بە گومڕا تۆمارکرابێ یاخود بە هیدایەتدراو! هەروەها ئێوە پێتان وایە هیدایەتی نەفسی خۆتان لەدەست خۆتانە و پەیوەندیی نییە بە الله، هەروەها پێتان وایە کە ئەوە خۆتانن نەفسی خۆتان پاراستووە لە تاوان، بەبێ ویست و هێزی الله، بەبێ ئیزنی الله! -پەنا بە الله.

**فمن زعم ذلك فقد غلا في القول، لأنه لو كان شيء لم يسبق في علم الله وقدره لكان لله في ملكه شريك ينفذ مشيئته في الخلق من دون الله والله سبحانه وتعالى يقول: {حبب إليكم الإيمان وزينه في قلوبكم}[1]، وهم له قبل ذلك كارهون، {وكره إليكم الكفر والفسوق والعصيان}[2]، وهم له قبل ذلك محبون، وما كانوا على شيء من ذلك لأنفسهم بقادرين.**

---

ئینجا وەڵامیان دەداتەوە: «**فمن زعم ذلك فقد غلا في القول، لأنه لو كان شيء لم يسبق في علم الله وقدره لكان لله في ملكه شريك ينفذ مشيئته في الخلق من دون الله**». واتە: هەر کەسێک ئاوا قسە بکات (لەبارەی قەدەر) ئەوا ڕۆچووە و سنووری بەزاندووە لە قسەکانی؛ چونکە ئەگەر شتێک هەبێت و لە زانست و قەدەری الله تۆمار نەبووبێت ئەوا دیارە الله هاوبەشێکی هەیە کەوا بە ویستی خۆی کاروبار و قەدەری خەڵک جێبەجێ دەکات لەبری الله!

ئینجا بەڵگەیان بۆ دێنێتەوە: «**والله سبحانه وتعالى يقول: {حبب إليكم الإيمان وزينه في قلوبكم}، وهم له قـــبل ذلك**

(١)(٢) سورەتی الحجرات، ئایەی ٧.

**كارهون، {وكره إليكم الكفر والفسوق والعصيان}، وهم له قبل ذلك محبون، وما كانوا على شيء من ذلك لأنفسهم بقادرين**».

واتە: الله -سبحانه وتعالی- دەفەرمووێ: {**ئیمانی لەدڵتان خۆشەویست و ڕازاوە کردووە**}. کەچی لەوەوپێش ڕقیان لێی بوو. هەروەها: {**هەروەها کوفر و تاوانی گەورە و بچووکی لەدڵتان ناپەسند کردووە**}. کەچی لەوەوپێش حەزیان لێی بوو. هەروەها ئەو ئیماندارانە هیچ توانایەکیان بەسەر نەفسی خۆیان نەبووە.

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: ئەوەتا ئیمامی "عمر بن الخطاب" -رضي الله عنه- لەوەوپێش کەسێکی مەیخۆر بوو، هەروەها موشریک بوو، هەروەها زۆر ڕقی لە پێغەمبەر دەبووەوە. بەڵام دواتر -بە ویستی الله- گۆڕا بەرەو موسڵمانێک کە مایەی ترس بوو بۆ قوڕەیشییە بتپەرستەکانی مەککە، پاشانیش بوو بە خەلیفەی موسڵمانان.

**ثم أخبر بما سبق لمحمد صلى الله عليه وسلم من الصلاة عليه والمغفرة له ولأصحابه فقال تعالى: {أشداء على الكفار رحماء بينهم}[1]، وقال تعالى: {ليغفر لك الله ما تقدم من ذنبك وما تأخر}[2]، فلولا علمه ما غفرها الله له قبل أن يعملها.**

---

بەڵگەی تر دەهێنێتەوە: «**ثم أخبر بما سبق لمحمد صلى الله عليه وسلم من الصلاة عليه والمغفرة له ولأصحابه فقال تعالى: {أشداء على الكفار رحماء بينهم}**». واتە: ئەوەتا الله لە ڕابردوودا (لە کتێبی تەوڕات و ئینجیل) باسی محمدی کردووە -صلى الله عليه وسلم-، هەروەها باسی فەزڵ و پلەوپایەی خۆی و هاوەڵەکانیشی کردووە، هەروەک فەرمووی: {**توندن لەسەر کافران، نەرمونیانن لەنێوان خۆیان**}.

بەڵگەیەکی تریش دەهێنێتەوە: «**وقال تعالى: {ليغفر لك الله ما تقدم من ذنبك وما تأخر}، فلولا علمه ما غفرها الله له قبل أن يعملها**».

واتە: الله فەرمووی: {**بۆ ئەوەی الله لە تاوانەکانی پێشووت خۆشبێت هەروەها ئەوەیشی کە دوات خستووە (واتە لە**

(١) سوڕەتی الفتح، ئایەی ٢٩.

(٢) سوڕەتی الفتح، ئایەی ٢.

..........................................................

**داهاتوو دەیکەی)}**. خۆ ئەگەر الله زانستی نەبووایە بەوەی لە داهاتوودا پێغەمبەرمان تاوان دەکات، ئەوا پێی نەدەگووت لە تاوانەکانی داهاتووت خۆشدەبم بەر لەوەی بیکات!

**وفضلا سبق لهم من الله قبل أن يخلقوا، ورضوانا عنهم قبل أن يؤمنوا، ثم أخبر بما هم عاملون آمنون قبل أن يعملوا وقال: {تراهم ركعا سجدا يبتغون فضلا من الله ورضوانا}(١). فتقولون أنتم إنهم قد كانوا ملكوا رد ما أخبر الله عنهم أنهم عاملون، وأن إليهم أن يقيموا على كفرهم مع قوله، فيكون الذي أرادوا لأنفسهم من الكفر مفعولا، ولا يكون لوحي الله فيما اختار تصديقا.**

---

بەڵگەی زیادتر دەهێنێتەوە: «**وفضلا سبق لهم من الله قبل أن يخلقوا، ورضوانا عنهم قبل أن يؤمنوا، ثم أخبر بما هم عاملون آمنون قبل أن يعملوا وقال: {تراهم ركعا سجدا يبتغون فضلا من الله ورضوانا}**». واتە: پێغەمبەر و هاوەڵانی لە ڕابردوودا (لە تەوڕات و ئینجیل) باسی فەزڵ و پلەوپایەیان کراوە بەر لە دروست بوونیان، هەروەها الله لەوکاتەوە ڕایگەیاندبوو ئەوان چ کردەوەیەک دەکەن، بەر لەوەی کردەوەکەش ئەنجام بدەن. هەروەک فەرمووی: **{دەیانبینیت کەوا لە ڕکوع و سوجدەن، چاویان لە فەزڵ و ڕەزامەندییە لەلایەن الله}**.

(١) سورەتی الفتح، ئایەی ٢٩.

هێشتا قەدەرییەکان پێداگرن لەسەر ئیلحاد، هەروەک ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- دەڵێت: «**فتقولون أنتم إنهم قد كانوا ملكوا رد ما أخبر الله عنهم أنهم عاملون، وأن إليهم أن يقيموا على كفرهم مع قوله، فيكون الذي أرادوا لأنفسهم من الكفر مفعولا، ولا يكون لوحي الله فيما اختار تصديقا**». واتە: کەچی ئێوە دەڵێن: هاوەڵان توانایان هەبوو هەواڵەکەی الله ڕەت بکەنەوە و لەسەر کافرێتی خۆیان بەردەوام بن ئەگەرچی الله بەوجۆرەش وەسفی کردوون! بەمەش ئیتر ئەو کوفرەی کە خۆیان دەیانویست دەهاتەجێ (واتە بە کافریی دەمانەوە!)، هەروەها وەحییەکەی الله ناڕاست دەبوو! -پەنا بە الله لەم دەمدرێژییە.

**بل لله الحجة البالغة، وفي قوله تعالى: {لولا كتاب من الله سبق لمسكم فيما أخذتم عذاب عظيم}[1]. فسبق لهم العفو من الله فيما أخذوا قبل أن يؤذن لهم، وقلتم: لو شاءوا خرجوا من علم الله في عفوه عنهم إلى ما لم يعلم من تركهم لما أخذوا، فمن زعم ذلك فقد غلا وكذب.**

---

ئینجا ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- بەڵگەی جەنگی "بدر" دەهێنێتەوە کە تیایدا موسڵمانان فیدیەیان وەرگرت و دیلەکانیان ئازادکرد لەکاتێکدا دەبووایە بیانکوژن، هەروەک ئەمیری موسڵمانان دەڵێت: «**بل لله الحجة البالغة، وفي قوله تعالى: {لولا كتاب من الله سبق لمسكم فيما أخذتم عذاب عظيم}. فسبق لهم العفو من الله فيما أخذوا قبل أن يؤذن لهم**». واتە: بەڵام بەڵگەی پتەو و بەهێز لەلای الله یە، هەروەها فەرموویەتی: **{خۆ ئەگەر نووسراوێکی پێشووتر نەبووایە لەلایەن الله ئەوا بەهۆی ئەوەی وەرتانگرت سزایەکی گەورەتان پێدەگەیشت}**. ئەوەتا لێخۆشبوونیان پێدرا لەبارەی ئەوەی وەریانگرتبوو ئەگەرچی مۆڵەتی وەرگرتنیشیان نەبوو.

نووسراوە: «**وقلتم: لو شاءوا خرجوا من علم الله في عفوه عنهم إلى ما لم يعلم من تركهم لما أخذوا، فـــمن زعم ذلك**

(١) سورەتی الأنفال، ئایەی ٦٨.

**فقد غلا وكذب**». واتە: ئێوە دەڵێن ئەگەر موجاهیدانی جەنگی "بدر" بیانویستایە ئەوا دەیانتوانی لەو زانستەی الله دەرچن کە تیایدا عەفو کراون، بەرەو حاڵەتێک کە نەزانراوە بەلای الله، ئەویش ئەوەیە کە فیدیەکە نەبەن! هەر کەسێک ئەمە بڵێت ئەوا ڕۆچووە و سنووری بەزاندووە و درۆی کردووە.

**ولقد ذكر الله بشرا كثيرا وهم يومئذ في أصلاب الرجال وأرحام النساء فقال: {وآخرين منهم لما يلحقوا بهم}[١]، وقال: {والذين جاءوا من بعدهم يقولون ربنا اغفر لنا ولإخواننا الذين سبقونا بالإيمان}[٢]، فسبقت لهم الرحمة من الله قبل أن يخلقوا، والدعاء لهم بالمغفرة ممن لم يسبقهم بالإيمان من قبل أن يدعوا لهم.**

---

له وەڵامدا بەڵگەیان بۆ دەهێنێتەوە: «**ولقد ذكر الله بشرا كثيرا وهم يومئذ في أصلاب الرجال وأرحام النساء فقال: {وآخرين منهم لما يلحقوا بهم}، وقال: {والذين جاءوا من بعدهم يقولون ربنا اغفر لنا ولإخواننا الذين سبقونا بالإيمان}**». واتە: الله باسی زۆر کەسی کردووە کە هێشتا هەر لەدایک نەبوونە و لەناو پشتی باوکیانن و لەناو ڕەحمی دایکیانن، لەداهاتوو دەبنە موسڵمان!، هەروەک فەرموویەتی: **{هەروەها کەسانێکی تریش لەوان (واتە لە ئیمانداران) کە هێشتا پێیان نەگەیشتوون}**. هەروەها فەرموویەتی: **{ئەوانەیشی کە لەدوایانەوە هاتوونە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان لێمان خۆشبە و لەو برایانەشمان خۆشبە کەوا بەر لە ئێمە ئیمانیان هێنابوو}**.

---

(١) سورەتی الجمعة، ئایەی ٣.

(٢) سورەتی الحشر، ئایەی ١٠.

ئینجا دەڵێت: «**فسبقت لهم الرحمة من الله قبل أن يخلقوا، والدعاء لهم بالمغفرة ممن لم يسبقهم بالإيمان من قبل أن يدعوا لهم**». واتە: ئەوەتا الله هەر لە ڕابردووەوە ڕەحمەتی پێدابوون بەر لە دروستکردنیان، هەروەها لە ڕابردووەوە وای دانابوو کە دوعای لێخۆشبوونیان بۆ بکرێت لەلایەن جیلی دوایان ئەگەرچی هێشتا هەر دوعایان بۆ نەکردبوون.

**ولقد علم العالمون بالله أن الله لا يشاء أمرا فتحول مشيئة غيره دون بلاغ ما شاء، ولقد شاء لقوم الهدى فلم يضلهم أحد، وشاء إبليس لقوم الضلالة فاهتدوا، وقال لموسى وهارون: {اذهبا إلى فرعون إنه طغى * فقولا له قولا لينا لعله يتذكر أو يخشى}[1]، وموسى في سابق علمه أنه يكون لفرعون عدوا وحزنا.**

---

نووسراوە: «**ولقد علم العالمون بالله أن الله لا يشاء أمرا فتحول مشيئة غيره دون بلاغ ما شاء، ولقد شاء لقوم الهدى فلم يضلهم أحد، وشاء إبليس لقوم الضلالة فاهتدوا**». واتە: ئەو کەسانەی زانان بە الله، چاک دەزانن کە ئەگەر الله ویستێکی لە شتێک هەبێت ئەوا شتەکە بە ویستی هیچ کەسێکی تر نابێت جگە لەو. ئەوەتا ویستی وابوو هیدایەتی قەومێک بدات، کەس نەیتوانی گومڕایان بکات، هەروەها ئیبلیس دەیویست قەومێک گومڕا ببن بەڵام هیدایەتیان وەرگرت.

ئینجا دەیەوێت ڕووداوەکانی پێغەمبەر موسا -علیه السلام- بکاتە بەڵگە، هەروەک دەڵێت: «**وقال لموسى وهارون: {اذهبا إلى فرعون إنه طغى * فقولا له قولا لينا لعلـه**

---

(١) سورەتی طه، ئایەی ٤٣ و ٤٤.

**يتذكر أو يخشى}، وموسى في سابق علمه أنه يكون لفرعون عدوا وحزنا**». واته: الله به موسا و هارِونى فه‌رموو: **{هه‌ردووكتان برِۆنه لاى فيرعه‌ون، به‌رِاستيى ئه‌و سنوورى به‌زاندووه * ئينجا له‌گه‌ڵى بدووێن به قسه‌ى نه‌رم به‌شكو بيربكاته‌وه ياخود بترسێت}**. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا الله له زانستى رِابردووى خۆيدا چاك ده‌يزانى موسا ده‌بێته دوژمن و خه‌مباركه‌رى فيرعه‌ون.

**فقال تعالى: {ونري فرعون وهامان وجنودهما منهم ما كانوا يحذرون}[1]، فتقولون أنتم: لو شاء فرعون كان لموسى وليا وناصرا، والله تعالى يقول: {ليكون لهم عدوا وحزنا}[2]، وقلتم: لو شاء فرعون لامتنع من الغرق والله تعالى يقول: {إنهم جند مغرقون}[3].**

---

ئینجا ئەمیری موسڵمانان بەڵگە دەهێنێتەوە کە چۆن الله پێشوەختە فەرموویەتی لە داهاتوودا موسا دەبێتە دوژمنی فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان: «**فقال تعالى: {ونري فرعون وهامان وجنودهما منهم ما كانوا يحذرون}، فتقولون أنتم: لو شاء فرعون كان لموسى وليا وناصرا، والله تعالى يقول: {ليكون لهم عدوا وحزنا}**». واتە: الله فەرمووی: **{دەمانەوێت ئەوە پیشانی فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان بدەین کەوا لێی دەترسان}**. جا ئێوە دەڵێن: ئەگەر فیرعەون بیویستایە ئەوا دەیتوانی ببێتە پشتیوانی موسا! کەچی الله -تعالى- دەڵێت: **{بۆ ئەوەی موسا ببێتە دوژمن و خەمبارکەریان}**.

---

(١) سورەتی القصص، ئایەی ٦.

(٢) سورەتی القصص، ئایەی ٨.

(٣) سورەتی الدخان، ئایەی ٢٤.

........................................

بەڵگەیەکی تریش: «**وقلتم: لو شاء فرعون لامتنع من الغرق والله تعالى يقول: {إنهم جند مغرقون}**». واتە: ئێوە دەڵێن ئەگەر فیرعەون بیویستایە دەیتوانی ڕێگر بێت لەبەردەم خنکانی!، کەچی الله دەڵێ: **{ئەوان لەشکرێکی نوقمکراون}**.

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: ڕووداوی پێغەمبەر موسا -علیە السلام- وەڵامی زۆر گرینگی تێدایە بۆ قەدەرییە مەجوسییەکان؛ چونکە ئەوان پێیان وایە مرۆڤ دەتوانێت بەپێچەوانەی ویستی الله بجوولێتەوە!، کەچی ئەوەتا بینیمان چۆن ویست و قەدەری الله هاتەجێ، فیرعەون و سەربازەکانیشی هیچیان پێ نەکرا.

**مثبت ذلك عنده في وحيه في ذكر الأولين، كما قال في سابق علمه لآدم قبل أن يخلقه: {إني جاعل في الأرض خليفة}[1]، فصار إلى ذلك بالمعصية التي ابتلي بها، وكما كان إبليس في سابق علمه أنه سيكون مذموما مدحورا، وصار إلى ذلك بما ابتلي به من السجود لآدم فأبى، فتلقى آدم التوبة فرحم، وتلقى إبليس اللعنة فغوى، ثم أهبط آدم إلى ما خلق له من الأرض مرحوما متوبا عليه، وأهبط إبليس بنظرته مدحورا مذموما مسخوطا عليه.**

---

ئینجا ئەمیری موسڵمانان دەیەوێت ڕووداوی سەرەتای دروستکردنی ئادەم بکاتە بەڵگە، هەروەک دەڵێت: «**مثبت ذلك عنده في وحيه في ذكر الأولين، كما قال في سابق علمه لآدم قبل أن يخلقه: {إني جاعل في الأرض خليفة}، فصار إلى ذلك بالمعصية التي ابتلي بها**». واتە: ئەمەش لە وەحییەکەی الله چەسپاوە کاتێک باسی سەرەتاکان دەکات. هەر بۆیەش بەر لەوەی ئادەم دروست بکات فەرمووی: {**من دەمەوێت لە زەویدا جێنشینێک دابنێم**}. بێگومان ئەمەش ڕوویدا کاتێک ئادەم بەهۆی تاوانەکەی خرایە سەر زەوی.

---

(١) سوڕەتی البقرة، ئایەی ٣٠.

ئینجا ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- بەڵگە بە حاڵی ئیبلیس دێنێتەوە، هەروەک دەڵێت: «**وكما كان إبليس في سابق علمه أنه سيكون مذموما مدحورا، وصار إلى ذلك بما ابتلي به من السجود لآدم فأبى، فتلقى آدم التوبة فرحم، وتلقى إبليس اللعنة فغوى، ثم أهبط آدم إلى ما خلق له من الأرض مرحوما متوبا عليه، وأهبط إبليس بنظرته مدحورا مذموما مسخوطا عليه**».

واتە: بەهەمان شێوە الله لە زانستی خۆیدا ئەوەی دانابوو کە ئیبلیس دەبێتە بوونەوەرێکی لۆمەکراو و دەرکراو لە ڕەحمەتی الله، ئەمەش ڕوویدا کاتێک تاقی کرایەوە بەوەی سوجدە ببات بۆ ئادەم بەڵام ڕەتی کردەوە، ئینجا ئادەم تەوبەی پێگەیشت و ئینجا الله لێی خۆشبوو. هەروەها ئیبلیس لەعنەتی پێگەیشت و ئینجا گومڕا بوو، پاشان ئادەم دابەزێندرایە سەر زەوی و بە شێوەیەکی ڕەحم پێکراو و لێخۆشبوو، بەهەمان شێوە ئیبلیس دابەزییە سەر زەوی و چاوەڕوانی مۆڵەتەکەی بوو (واتە قیامەت)، بە شێوەیەکی لۆمەکراو و دەرکراو کەوا تووڕەیی بەسەردا باریوە.

**وقلتم أنتم: إن إبليس وأولياءه من الجن قد كانوا ملكوا رد علم الله والخروج من قسمه الذي أقسم به إذ قال: {فالحق والحق أقول * لأملأن جهنم منك وممن تبعك منهم أجمعين}[1]، حتى لا ينفذ له علم إلا بعد مشيئتهم.**

---

الله لەنێو کتێبەکەیدا سوێندی خواردووە بەوەی ئیبلیس شوێنی ئاگرە، کەچی قەدەرییە مولحیدەکان دەڵێن ئیبلیس دەتوانێ سوێندی الله هەڵوەشێنێتەوە و نەچێتە ئاگر! -پەنا بە الله-، هەروەک ئەمیری موسڵمانان باس دەکات: «**وقلتم أنتم: إن إبليس وأولياءه من الجن قد كانوا ملكوا رد علم الله والخروج من قسمه الذي أقسم به إذ قال: {فالحق والحق أقول * لأملأن جهنم منك وممن تبعك منهم أجمعين}، حتى لا ينفذ له علم إلا بعد مشيئتهم**». واتە: ئێوە (قەدەرییەکان) دەڵێن: ئیبلیس و پشتیوانەکانی دەتوانن زانستی الله هەڵوەشێننەوە و لەو سوێندەش دەرباز ببن کە گووتوویەتی: **{من حەقم و حەقیش دەڵێم * سوێند بێت دۆزەخ پڕ دەکەم لە تۆ و لەوەیشی کە شوێنت کەوتبێ لەوان هەر هەمووتان}**. ئەم قسەیەشتان کرد تاکو وای پیشانبدەن گوایە زانستی الله جێبەجێ نابێت ئیللا مەگەر ئیبلیس و شوێنکەوتەکانی خۆیان بیانەوێت!

---

(١) سورەتی ص، ئایەی ٨٤ و ٨٥.

**فماذا تريدون بهلكة أنفسكم في رد علم الله، فإن الله عز وجل لم يشهدكم خلق أنفسكم، فكيف يحيط جهلكم بعلمه، وعلم الله ليس بمقصر عن شیء هو كائن ولا يسبق علمه في شيء فيقدر أحد على رده، فلو كنتم تنتقلون في كل ساعة من شيء إلى شيء هو كائن لكانت مواقعكم عنده.**

---

ئینجا ئەمیری موسڵمانان سەرزەنشتیان دەکات و پێیان دەڵێت: «**فماذا تريدون بهلكة أنفسكم في رد علم الله، فإن الله عز وجل لم يشهدكم خلق أنفسكم، فكيف يحيط جهلكم بعلمه**». واتە: چیتان داوە لەوەی خۆتان لەناوبەرن بەهۆی ڕەت کردنەوەی زانستی الله؟ ئەسڵەن الله لەکاتی دروستکردنی خودی خۆتاندا ئێوەی نەکردووەتە شایەد و بینەر، ئیتر چۆن بەم جەهالەتەی خۆتان دەتوانن بگەن بە زانستی ئەو؟!

هەروەها دەڵێت: «**وعلم الله ليس بمقصر عن شیء هو كائن ولا يسبق علمه في شيء فيقدر أحد على رده**». واتە: زانستی الله دابڕاو نییە لەهیچ شتێک، هەروەها ئەگەر لە زانستی خۆیدا ویستی لە شتێک هەبووبێ ئەوا هیچ کەسێک ناتوانێت ڕێگری بێت.

............................................................

هەروەها پێیان دەڵێت: «**فلو كنتم تنتقلون في كل ساعة من شيء إلى شيء هو كائن لكانت مواقعكم عنده**». واتە: ئەگەر ئێوە (قەدەرییەکان) لە هەموو کاژێرێک بارۆدوختان بگۆڕێت لە شتێک بۆ شتێکی تر، ئەوا چاک بزانن هەموو ئەم بارودۆخە جیاوازانەتان لای الله یە. (واتە زانستی هەیە بە گۆڕانکارییەکانتان).

**ولقد علمت الملائكة قبل خلق آدم ما هو كائن من العباد في الأرض من الفساد وسفك الدماء فيها، وما كان لهم في الغيب من علم فكان في علم الله الفساد وسفك الدماء، وما قالوا تخرصا إلا بتعليم العليم الحكيم لهم، فظن ذلك منهم وقد أنطقهم به.**

---

ئینجا ئەمیری موسڵمانان پێشوەختە وەڵامی گومانێک دەداتەوە لەبارەی فریشتەکان، نەوەک قەدەرییەکان بڵێن: فریشتەکان زانستی غەیبیان هەیە!

هەروەک دەڵێت: «**ولقد علمت الملائكة قبل خلق آدم ما هو كائن من العباد في الأرض من الفساد وسفك الدماء فيها، وما كان لهم في الغيب من علم، فكان في علم الله الفساد وسفك الدماء، وما قالوا تخرصا إلا بتعليم العليم الحكيم لهم، فظن ذلك منهم وقد أنطقهم به**».

واتە: فریشتەکان بەر لە دروستکردنی ئادەم -علیه السلام- دەیانزانی چ جۆرە بوونەوەرێک لەسەر زەوی دەبن و چۆن فەساد و خوێنڕێژیی بەرپا دەبێ لەسەری، ئەو زانینەیشیان بە غەیب نەبوو، بەڵکو ئەم زانینە لە عیلمی الله بوو. لەگەڵ ئەوەش فریشتەکان بە درۆ ئەم قسەیان نەکرد، بەڵکو "العليم الحكيم" فێریانی کردبوو. ئیتر ئەوانیش

هەستیان بەمە کرد (بەئیزنی الله)، هەروەها پێشبینییەکەیان دەربڕی.

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: نموونەیەکی تر لەوانەی کە الله هەندێک لە زانستی غەیبی فێرکردبوون وەکو خضر -علیه السلام-، ئەمەش لە ئایاتەکانی ٦٥ تا ٨٢ لە سورەتی "الكهف" باسکراوە. الله لەبارەیەوە دەڵێ: {**فوجدا عبدا من عبادنا ءاتيناه رحمة من عندنا وعلمناه من لدنا علما**}[(١)]. واتە: {**-موسا و هاوڕێکەی- عەبدێکی ئێمەیان دۆزییەوە کە ڕەحمەتمان پێی گەیاندبوو و زانستمان فێرکردبوو**}.

(١) سورەتی الكهف، ئایەی ٦٥.

**فأنكرتم أن الله أزاغ قوما قبل أن يزيغوا، وأضل قوما قبل أن يضلوا، وهذا مما لا يشك فيه المؤمنون بالله إن الله قد عرف قبل أن يخلق العباد مؤمنهم من كافرهم، وبرهم من فاجرهم، وكيف يستطيع عبد هو عند الله مؤمن أن يكون كافرا، أو هو عند الله كافر أن يكون مؤمنا، والله تعالى يقول: {أومن كان ميتا فأحييناه وجعلنا له نورا يمشي به في الناس كمن مثله في الظلمات ليس بخارج منها}[(١)]، فهو في الضلالة ليس بخارج منها أبدا إلا بإذن الله.**

---

ئەوجارەیان باسی گومانێکی تریان دەکات، هەروەک نووسراوە: «**فأنكرتم أن الله أزاغ قوما قبل أن يزيغوا، وأضل قوما قبل أن يضلوا**». واتە: وادیارە ئەوەتان بەدڵ نەبووە کە الله قەومێک دووربخاتەوە لە حەق بەبێ ئەوەی قەومەکە ویستیان لێبێ، هەروەها قەومێک گومڕا بکات بەبێ ئەوەی بەخۆیان خۆیان گومڕا بکەن.

لە وەڵامدا پێیان دەڵێت: «**وهذا مما لا يشك فيه المؤمنون بالله إن الله قد عرف قبل أن يخلق العباد مؤمنهم من كافرهم، وبرهم من فاجرهم، وكيف يستطيع عبد هو عند الله مؤمن أن يكون كافرا، أو هو عند الله كافر أن يكون مؤمنا**». واتە: یەکێک

---

(١) سورەتی الأنعام، ئایەی ١٢٢.

..............................................

لەو شتانەی ئیمانداران (زانایان) لێی دڵنیان ئەوەیە کە الله بەر لە دروستکردنی مرۆڤەکان زانیویەتی کامەن عەبدە ئیماندارەکان و کافرەکان، هەروەها چاکەکار و خراپەکارەکان. جا چۆن عەبدێک دەتوانێت خۆی کافر بکات لەکاتێکدا لەلای الله بە ئیماندار تۆمار کرابێت؟! یاخود بیەوێت ئیماندار بێت لەکاتێکدا لەلای الله بە کافر تۆمار کرابێت؟! (ناتوانێت بەبێ ئیزنی الله).

ئینجا بەڵگە دێنێتەوە: «**والله تعالى يقول: {أومن كان ميتا فأحييناه وجعلنا له نورا يمشي به في الناس كمن مثله في الظلمات ليس بخارج منها}، فهو في الضلالة ليس بخارج منها أبدا إلا بإذن الله**». واتە: الله -تعالی- دەڵێت: **{ئایا ئەو کەسەی مردووە و ئێمە زیندوومان کردووەتەوە و هەروەها ڕووناکیمان پێیداوە تاکو هاتوچۆی پێ بکات لەنێو خەڵک، ئایا وەکو ئەو کەسەیە کە لەناو تاریکییە و توانای دەرچوونی نییە؟}**. جا ئەو کەسەی لەناو گومڕایی بێت ئەوا ناتوانێت لێی دەرچێت هەرگیز تەنها بە ئیزنی الله نەبێت. (بەهەمان شێوە موسڵمانیش).

**ثم آخرون اتخذوا من بعد الهدى عجلا جسدا فضلوا به فعفى عنهم لعلهم يشكرون، فصاروا من أمة قوم موسى أمة يهدون بالحق وبه يعدلون، وصاروا إلى ما سبق لهم.**

---

ئێستا ئەمیری موسڵمانان نموونە بە قەومەکەی موسا دەهێنێتەوە کە گومڕا بوون بەڵام الله هیدایەتی دانەوە و لێیان خۆشبوو و سزای نەدان.

هەروەک دەڵێت: «**ثم آخرون اتخذوا من بعد الهدى عجلا جسدا فضلوا به فعفى عنهم لعلهم يشكرون، فصاروا من أمة قوم موسى أمة يهدون بالحق وبه يعدلون، وصاروا إلى ما سبق لهم**». واتە: ئینجا کەسانێک لەدوای ئەوەی هیدایەتیان پێگەیشتبوو ئیتر ڕوویان کردەوە پەرستنی پەیکەری گوێرەکە! بەمەش گومڕا بوون، ئینجا الله لێیان خۆشبوو (لەپاش دوعای موسا -عليه السلام-) بەشکو سوپاسگوزار بن. ئینجا لەناو قەومی موسا کۆمەڵەیەکی چاکساز پەیدابوون کە ڕێنموویی خەڵک دەکەن بە بەڵگە و حەق، هەروەها بە حەقەکە دادگەریێتیی دەکەن (واتە حوکم دەدەن). بەمەش هەر ویستی الله بۆیان جێبەجێ بوو کە لە ڕابردوو بۆی دانابوون.

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: ئەوەتا قەومەکەی موسا نیەتی گومڕاییان هەبوو، بەڵام لەدوای دوعای پێغەمبەرەکەیان ئیتر الله لێیان خۆشبوو و هیدایەتی بەشێکیانی دایەوە و سزای

.............................................

نەدان ئەگەرچی بەم کارەیان موشریک ببوونەوە. ئەمەش لە ئایاتەکانی ١٤٨ تا ١٥٣ لە سورەتی "الأعراف" باسکراوە.

**ثم ضلت ثمود بعد الهدى، فلم يعف عنهم ولم يرحموا، فصاروا في علمه إلى صيحة واحدة فإذا هم خامدون، فنفذوا إلى ما سبق لهم أن صالحا رسولهم، وأن الناقة فتنة لهم، وأنه مميتهم كفارا فعقروها.**

---

ئەوجارە ئەمیری موسڵمانان نموونە بە قەومی "ثمود" دەهێنێتەوە کە هاوشێوەی قەومی موسا گومڕا بوون، بەڵام الله ویستی وابوو لێیان نەبوورێت، بۆیەش سزای بۆ ناردن و لەناوی بردن بەهۆی شیرکەکەیان.

هەروەک باس دەکات: «**ثم ضلت ثمود بعد الهدى، فلم يعف عنهم ولم يرحموا، فصاروا في علمه إلى صيحة واحدة فإذا هم خامدون، فنفذوا إلى ما سبق لهم أن صالحا رسولهم، وأن الناقة فتنة لهم، وأنه مميتهم كفارا فعقروها**». واتە: ئینجا قەومی "ثمود" گومڕا بوون لەدوای ئەوەی هیدایەت درابوون، هەروەها الله لێیان خۆش نەبوو و ڕەحمیان پێ نەکرا، بۆیەش هەر ئەو قەدەرەیان بەسەردا سەپا کەوا الله لەوەوپێش بۆیانی دانابوو، کە بریتییە لە دەنگێکی زەبەلاح و بەهێز، ئیتر هەموویان ڕاستەوخۆ مردن. کەواتە هەر ئەو قەدەریان بەسەردا سەپا کەوا الله بۆیانی دانابوو، بەوەی کە صالح -علیه السلام- پەیامبەریان بێت، هەروەها حوشتر بووە هۆی فیتنە و

سزادانیان، هەروەها اللە بە کافرێتیی ئەوانی کوشت بەهۆی کوشتنی حوشترەکە.

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: بەڵێ لەدوای کوشتنی حوشترەکە پەشیمان بوونەوە بەڵام سوودی نەبوو، هەروەک اللە -تبارك وتعالى- فەرمووی: {**فعقروها فأصبحوا نادمين * فأخذهم العذاب ...**}[1]. واتە: {**حوشترەکەیان کوشت و ئینجا پەشیمان بوونەوە * ئەوجا سزا یاخەی گرتن ...**}.

(١) سورەتی الشعراء، ئایەی ١٥٧ و ١٥٨.

**وكان إبليس فيما كانت فيه الملائكة من التسبيح والعبادة ابتلي فعصى فلم يرحم، وابتلي آدم فعصى فرحم، وهم آدم بالخطيئة فنسي، وهم يوسف بالخطيئة فعصم، فأين كانت الاستطاعة عند ذلك؟ هل كانت تغني شيئا فيما كان من ذلك حتى لا يكون، أو تغني فيما لم يكن حتى يكون، فتعرف لكم بذلك حجة، بل الله أعز مما تصفون وأقدر.**

---

ئەوجارەیان نموونەی "ئادەم و ئیبلیس" دەهێنێتەوە، دەڵێت: «**وكان إبليس فيما كانت فيه الملائكة من التسبيح والعبادة ابتلي فعصى فلم يرحم، وابتلي آدم فعصى فرحم**». واتە: ئەوەتا ئیبلیس وەکو فریشتەکان زیکر و پەرستنی دەکرد، ئینجا تاقی کرایەوە و سەرپێچی کرد بەڵام ڕەحمی پێ نەکرا. لە هەمان کاتدا ئادەمیش تاقی کرایەوە و سەرپێچی کرد بەڵام ڕەحمی پێ کرا.

ئەوجارەش نموونەی "ئادەم و یوسف" -عليهما السلام- دەهێنێتەوە، دەڵێت: «**وهم آدم بالخطيئة فنسي، وهم يوسف بالخطيئة فعصم**». واتە: ئادەم خەریکبوو تاوان بکات، ئیتر لەیادی چوو و تاوانەکەی کرد (بە ویستی الله)، بەهەمان شێوە یوسف خەریکبوو تاوان بکات، بەڵام پارێزرا (واتە نەیکرد، ئەویش هەر بە ویستی الله).

ئینجا سەرزەنشتی قەدەرییەکان دەکات و دەپرسێ: «**فأين كانت الاستطاعة عند ذلك؟ هل كانت تغني شيئا فيما كان من ذلك حتى لا يكون، أو تغني فيما لم يكن حتى يكون، فتعرف لكم بذلك حجة، بل الله أعز مما تصفون وأقدر**». واتە: کوا ئەو توانایەی ئێوە باسی دەکەن؟! ئایا ئەو توانایە هیچ سوودی هەبوو؟ ئایا دەیتوانی ببێتە ڕێگر لەبەردەم قەدەرێکی چەسپاو بۆ ئەوەی ڕوونەدات؟ یاخود بەپێچەوانەوە: ئایا دەیتوانی وابکات شتێک ڕووبدات کە لە قەدەری الله نووسرابێ ڕوونادات؟! تا ببێتە بەڵگەیەک بەدەستتان!! الله بەهێزترە لەوەی وەسفی دەکەن.

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: تەنانەت ئادەم -عليه السلام- لەپاش تاوانەکەی نەیدەزانی داوای لێخۆشبوونیش بکات! هەروەک الله فەرمووی: {**فتلقى ءادم من ربه كلمات فتاب عليه ...**}[1]. واتە: {**ئینجا ئادەم لەلای پەروەردگاریەوە چەند وشەیەکی پێ گەیشت (واتە دوعا)، ئینجا لێی خۆشبوو ...**}. کەواتە الله هەر خۆی فێری کرد چۆن داوای لێخۆشبوون بکات؛ چونکە ویستی وابوو لێی خۆشبێ. ئەمەش ڕوویدا.

---

(١) سورەتی البقرة، ئایەی ٣٧.

**وأنكرتم أن يكون سبق لأحد من الله ضلالة أو هدى، وإنما علمه بزعمكم حافظ، وأن المشيئة في الأعمال إليكم إن شئتم أحببتم الإيمان فكنتم من أهل الجنة، ثم جعلتم بجهلكم حديث رسول الله صلى الله عليه وسلم الذي جاء به أهل السنة وهو مصدق للكتاب المنزل أنه من ذنب مضاه ذنبا خبيثا في قول النبي صلى الله عليه وسلم حين سأله عمر: أرأيت ما نعمل أشيء قد فرغ منه أم شيء نأتنفه؟ فقال صلى الله عليه وسلم: «بل شيء قد فرغ منه»(١) فطعنتم بالتكذيب له.**

---

ئینجا پێیان دەڵێ: «**وأنكرتم أن يكون سبق لأحد من الله ضلالة أو هدى، وإنما علمه بزعمكم حافظ، وأن المشيئة في الأعمال إليكم إن شئتم أحببتم الإيمان فكنتم من أهل الجنة**».

واتە: ئێوە (قەدەرییەکان) ئەوە ڕەت دەکەنەوە کە هیدایەت یاخود گومڕایی بۆ سەر هیچ کەسێک یەکلاکرابێتەوە! پێتان وایە زانستی الله تەنها بریتییە لە تۆمارکردنی ڕووداوەکان! هەروەها پێتان وایە ویستی کردەوەکان لای خۆتانە، ئەگەر بتانەوێ دەتوانن حەزتان لە ئیمان بێت و ببن بە ئەهلی بەهەشت!

(١) کتێبی سنن الترمذي > كتاب تفسير القرآن عن رسول الله –صلى الله عليه وسلم– > باب ومن سورة هود > فەرموودەی ژمارە: ٣١١١.

ئینجا باسی ڕیسواییەکی تری قەدەرییەکان دەکات، ئەویش بریتییە لە بە درۆ زانینی حەدیسی پێغەمبەر -علیه السلام-؛ تەنها چونکە ناگونجێ لەگەڵ بیدعە و کوفرەکەیان! هەروەک دەڵێت: «**ثم جعلتم بجهلكم حديث رسول الله صلى الله عليه وسلم الذي جاء به أهل السنة وهو مصدق للكتاب المنزل أنه من ذنب مضاه ذنبا خبيثا في قول النبي صلى الله عليه وسلم حين سأله عمر: أرأيت ما نعمل أشيء قد فرغ منه أم شيء نأتنفه؟ فقال صلى الله عليه وسلم: «بل شيء قد فرغ منه» فطعنتم بالتكذيب له**». واتە: ئێوە بە جەهلی خۆتان هاتوونە و ئەو حەدیسەی نێردراوی الله -صلى الله عليه وسلم- کەوا پشتڕاستکەرەوەی قورئانە و تیایدا عمر پرسیاری لێدەکات: ئەو کردەوانەی ئێمە دەیکەین ئایا یەکلابووەتەوە یاخود واخۆمان دروستی دەکەین؟، ئەویش فەرمووی: «**بەدڵنیاییەوە یەکلابووەتەوە**». کەچی ئێوە ئەم حەدیسەتان بە درۆ خستەوە.

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: ئیمامی عمر -رضي الله عنه- ویستوویەتی بزانێت ئایا ئەم گەردوون و ژیانە لە زانستی الله چۆنە؟، ئایا الله هەمووی یەکلا کردووەتەوە چی دەبێ و نابێ؟، یان مرۆڤەکان خۆیان قەدەریان دادەڕێژن و الله تەنها تۆماری دەکات؟ لە وەڵامدا پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- پێی ڕاگەیاند کەوا الله قەدەری هەمووانی داڕشتووە و کۆتایی پێهێناوە و یەکلای کردووەتەوە.

هەروەها دەڵێم: ئیمامی الترمذي -رحمه الله- ئەم حەدیسەی چەند جارێک هێناوەتەوە لە کتێبەکەی، یەکێکیانی "ضعيف" کردووە و ئەوانی تریشی "حسن" کردووە. کەچی قەدەرییەکان هەمووی "ضعيف" دەکەن!

گریمان وایدانێین "ضعيف" ـە... ئەوەتا حەدیسی ترمان هەیە کە "صحيح" ـە بەبێ گومان، هەروەک هاتووە: «**جاء سراقة بن مالك بن جعشم، قال: يا رسول الله، بين لنا ديننا كأنا خلقنا الآن، فيما العمل اليوم، أفيما جفت به الأقلام وجرت به المقادير؟ أم فيما نستقبل؟ قال: بل فيما جفت به الأقلام وجرت به المقادير**»[1].

---

(١) کتێبی صحيح مسلم > كتاب القدر > باب كيفية الخلق الآدمي في بطن أمه > فەرموودەی ژمارە: ٢٦٤٨.

.......................................................

واتە: «**سراقة کوڕی مالك کوڕی جعشم هات و گووتی: ئەی نێردراوی الله، دینەکەمان بۆ ڕوونبکەوە وەک بڵێی ئێمە ئێستا دروست بووبین، کردەوەکانی ئەمڕۆمان ئایا لە ڕابردوودا نووسراوە و حیبرەکەی وشک بووە و قەدەرەکە جێبەجێ بووە؟ یان خۆمان دەیهێنینە جێ؟ ئەویش گووتی: حیبری قەڵەمەکان وشک بووە و قەدەریش جێبەجێ دەبێ**».

**وتعليم من الله في علمه إذ قلتم: إن كنا لا نستطيع الخروج منه فهو الجبر والجبر عندكم الحيف، فسميتم نفاذ علم الله في الخلق حيفا، وقد جاء الخبر: إن الله خلق آدم فنثر ذريته في يده فكتب أهل الجنة وما هم عاملون، وكتب أهل النار وما هم عاملون.**

---

یەکێکی تر لە بەدڕەوشتیی قەدەرییەکان ئەوەیە کە پاش ئەوەی دەمکوت کران بەبەڵگەی قورئان، ئیتر گووتوویانە: «**إذ قلتم: إن كنا لا نستطيع الخروج منه فهو الجبر والجبر عندكم الحيف، فسميتم نفاذ علم الله في الخلق حيفا**». واتە: ئێوە دەڵێن: ئەگەر وابێ و ئێمە نەتوانین لە قەدەری الله دەرچین ئەوا ئەم کارە زۆرەملێیە، زۆرەملێش لەلای ئێوە زوڵمە، کەواتە ئێوە جێبەجێ بوونی قەدەری الله بە زوڵم دەزانن!

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: لەناو قەومی کوردیش وشەی "حەیف" باوە، دەبینین کاتێک ڕووداوێکیان بەدڵ نییە دەڵێن: حەیف خۆزگا وانەبووایە!! -پەنا بە الله-، پێویستە زۆر وریای دەممان بین، گشت وشەیەک لێپرسینەوەی لەسەرە.

نووسراوە: «**وقد جاء الخبر: إن الله خلق آدم فنثر ذريته في يده فكتب أهل الجنة وما هم عاملون، وكتب أهل النار وما هم عاملون**». واتە: هەواڵمان پێگەشتووە: الله ئادەمی دروست

.......................................

کردووه و نەوەکانیشی بڵاوکردووەتەوە و لەوکات ئەهلی بەهەشتی تۆمار کردووە لەگەڵ کردەوەکانیان، هەروەها ئەهلی ئاگری تۆمار کردووە لەگەڵ کردەوەکانیان.

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: پێدەچێ ئەمیری موسڵمانان مەبەستی لە حەدیسی پێغەمبەر نەبووبێ؛ چونکە هیچ حەدیسێکم نەدۆزییەوە لە پێغەمبەرەوە -عليه السلام- بەم وشانە (لفظ)، بەڵکو ئەم حەدیسە لە ئیمامی "عمر بن الخطاب" -رضي الله عنه- بۆمان ماوەتەوە هەروەک ئیمامی اللالكائي -رحمه الله- باسی دەکات: «**خطب عمر بن الخطاب بالجابية فتشهد ثم قال: من يضلل الله فلا هادي له، وكان الجاثليق بين يديه ثم قال: لا إن الله لا يضل أحدا، فقال عمر: ما يقول؟ فكرهوا أن يخبروه، ثم عاد فقال: من يضلل الله فلا هادي له، فنفض الجاثليق ثوبه ينكر ما يقول عمر قال: إن الله لا يضل أحدا مرتين أو ثلاثا، فقال عمر: ما يقول؟، قالوا: يا أمير المؤمنين يزعم أن الله لا يضل أحدا، فقال عمر: كذبت يا عدو الله بل الله خلقك، والله يضلك، ثم يميتك فيدخلك النار إن شاء الله، أما والله لولا ولث عهد لك لضربت عنقك، إن الله خلق الخلق وقال حين خلق آدم نثر ذريته في يده وكتب أهل الجنة وما هم عاملون، وكتب أهل النار وما**

**هم عاملون، ثم قال: هؤلاء لهذه، وهؤلاء لهذه. فتفرق الناس وما يختلف في القدر اثنان، ولقد كان من الناس من قبل ذلك من ينطبق فيه»**[1].

واته: «**عمر بن الخطاب له ناوچەی الجابية وتاريدا (ناوچەيەكە لە نزيک ديمەشق لە شام)، ئينجا شايەتومانی هێنا و گووتی: هەر كەسێک الله گومڕای بكات ئەوا هيچ كەسێک نابێتە هيدايەتدەری، لەوكاتە جاثليق (پياوێكی دينيی گاورەكانە) بە دەنگێكی نزم گووتی: نەخێر، الله هيچ كەسێک گومڕا ناكات!، ئيمامی عمر گووتی: ئەمە چی دەڵێ؟، موسڵمانانيش نەيانويست پێی بڵێن، ئيتر ئەويش بەردەوام بوو لە وتارەكەی، دووبارە گووتييەوە: هەر كەسێک الله گومڕای بكات ئەوا هيچ كەسێک نابێتە هيدايەتدەری. ئيتر جاثليق جلەكەی خستە سەری خۆی و بە دەنگێكی نزمەوە دوو سێ جار گووتی: الله هيچ كەسێک گومڕا ناكات! ئيمامی عمر گووتی: ئەمە چی دەڵێ؟، خەڵک گووتيان: ئەی ئەميری موسڵمانان، ئەمە پێی وايە الله هيچ كەسێک گومڕا ناكات. ئيمامی عمر وەڵامی جاثليق ی دايەوە و گووتی: درۆت كرد**

(١) كتێبی شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة > بەرگی چوارەم > سياق ما روي وما فعل من الإجماع في آيات القدر > فەرموودەی ژمارە: ١١٩٧.

ئەی دوژمنی اللە، بەڵکو اللە دروستت دەکات، اللە گومڕات دەکات، ئینجا دەتمرێنێ و دەتخاتە ناو ئاگر ئەگەر ویستی لێبێ. سوێند بە اللە ئەگەر گرێبەستت نەبووایە (واتە: عقد ذمة) ئەوا لە ملم دەدای. بەڕاستیی اللە خەڵکی دروست کرد، هەروەها کاتێک ئادەمی دروست کرد ئیتر نەوەکانی بڵاو کردەوە و لەوکاتەدا ئەهلی بەهەشتی تۆمارکرد لەگەڵ کردەوەکانیان، هەروەها ئەهلی ئاگری تۆمارکرد لەگەڵ کردەوەکانیان، ئینجا (اللە سبحانە) فەرمووی: ئەوانە بۆ ئەم شوێنە (بەهەشت) و ئەوانەش بۆ ئەم شوێنە (ئاگر). لەدوای وتارەکەش خەڵک بڵاوبوونەوە و ئیتر هیچیان کێشەیان لە قەدەر نەمابوو، بەڵام لەوەوپێش کەسانێک هەبوون کەوا ئەم کێشەیەیان تێدابوو».

**وقال سهل بن حنيف يوم صفين: أيها الناس اتهموا آراءكم على دينكم، فوالذي نفسي بيده لقد رأيتنا يوم أبي جندل ولو نستطيع رد أمر رسول الله صلى الله عليه وسلم لرددناه، والله ما وضعنا سيوفنا على عواتقنا إلا أسهل بنا على أمر نعرفه قبل أمركم هذا.**

---

نووسراوه: «**وقال سهل بن حنيف يوم صفين: أيها الناس اتهموا آراءكم على دينكم، فوالذي نفسي بيده لقد رأيتنا يوم أبي جندل ولو نستطيع رد أمر رسول الله صلى الله عليه وسلم لرددناه، والله ما وضعنا سيوفنا على عواتقنا إلا أسهل بنا على أمر نعرفه قبل أمركم هذا**». نەمتوانی بە ڕوونیی ئەم ڕووداوەی جەنگی "صفين" وەرگێڕم، بەڵام وادەردەکەوێت ئەمیری موسڵمانان مەبەستی لەو بڕگەیە بێت کە نووسراوە: «**ولو نستطيع رد أمر رسول الله صلى الله عليه وسلم لرددناه**». واتە: ئەگەر بمانتوانیایە فەرمانەکەی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- ڕەت بکەینەوە ئەوا ڕەتمان دەکردەوە. (مەبەستی ڕێککەوتنی مەککەیە لەبری جەنگ کردن). والله أعلم.

**ثم أنتم بجهلكم قد أظهرتم دعوة حق على تأويل باطل، تدعون الناس إلى رد علم الله فقلتم: الحسنة من الله، والسيئة من أنفسنا، وقال أئمتكم وهم أهل السنة: الحسنة من الله في علم قد سبق، والسيئة من أنفسنا في علم قد سبق.**

---

قەدەرییەکان لەڕێی بانگەوازێکی ناڕوونەوە هەوڵیانداوە خەڵک بۆ خۆیان بانگ بکەن، هەروەک ئەمیری موسڵمانان دەڵێت: «**ثم أنتم بجهلكم قد أظهرتم دعوة حق على تأويل باطل، تدعون الناس إلى رد علم الله فقلتم: الحسنة من الله، والسيئة من أنفسنا**». واتە: ئێوە بە جاهیلیێتی خۆتان دروشمێکی حەق دەڵێن بە مەبەستێکی چەوت؛ بۆ ئەوەی زانستی الله هەڵوەشێننەوە، کاتێک دەڵێن: کردەوە چاکەکان لەلایەن الله یە، کردەوە خراپەکانیش لەلایەن خۆمانە.

ئینجا وەڵامیان دەداتەوە: «**وقال أئمتكم وهم أهل السنة: الحسنة من الله في علم قد سبق، والسيئة من أنفسنا في علم قد سبق**». واتە: بەڵام ئیمامەکانتان (واتە زانایانی ئەهلی سوننە) دەڵێن: بەڵێ کردەوە چاکەکان لەلایەن الله یە بەڵام بە زانینێکی پێشوەختەی الله، بەهەمان شێوەش کردەوە خراپەکان لەلایەن خۆمانەوە بەرهەم هاتووە بەڵام هەر بە زانینێکی پێشوەختەی الله.

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: لە ڕووکەشدا بانگەشەکەی قەدەرییەکان خۆی لە حەق دەدات بەڵام ئەگەر خوێنەر دیقەت بدات ئەوا تێدەگات مەبەستێکی تری لەپشتە، ئەویش ئەوەیە دەیانەوێ بڵێن: لەقەدەری الله تەنها کرداری چاکی تێدایە، کردەوەی خراپی لای خۆی تۆمار نەکردووە و ئاگای لێ نییە بەڵکو خۆمان دروستی دەکەین!! -پەنا بە الله.

بەڵام ئەهلی سوننە دەڵێن: ڕاستە الله فەرمانی بە خراپە نەکردووە بەڵکو بەرهەمی دڵی پیسی مرۆڤە، بەڵام بێگومان الله لە قەدەر تۆماری کردووە، واتە ئاگادارە لەو کردەوە خراپانەی مرۆڤەکان دەیکەن لە داهاتوو.

**فقلتم: لا يكون ذلك حتى يكون بدؤها من أنفسنا، كما بدء السيئات من أنفسنا، وهذا رد للكتاب منكم، ونقض للدين، وقد قال ابن عباس حين نجم القول بالقدر: هذا أول شرك هذه الأمة، والله ما ينتهي بهم سوء رأيهم حتى يخرجوا الله من أن يكون قدر خيرا، كما أخرجوه من أن يكون قدر شرا.**

---

نووسراوە: «**فقلتم: لا يكون ذلك حتى يكون بدؤها من أنفسنا، كما بدء السيئات من أنفسنا، وهذا رد للكتاب منكم، ونقض للدين**». واتە: ئێوە دەڵێن: شتی وا نابێ، پێویستە کارە خێرەکانیش هەر لە خودی ئێمە سەرچاوە بگرن هەروەک چۆن خراپەش هەر لە خودی ئێمە سەرچاوەی گرتووە!! بێگومان ئەمەش بریتییە لە ڕەتکردنەوەی قورئان لەلایەن ئێوە، هەروەها هەڵوەشێنەری دینە.

ئینجا گوفتاری عبدالله بن عباس -رضي الله عنه- باس دەکات بۆیان؛ بەشکو بۆیان دەرکەوێت ئەم بیروباوەڕە شیرکە! -پەنا بە الله-، هەروەک دەڵێت: «**وقد قال ابن عباس حين نجم القول بالقدر: هذا أول شرك هذه الأمة، والله ما ينتهي بهم سوء رأيهم حتى يخرجوا الله من أن يكون قدر خيرا، كما أخرجوه من أن يكون قدر شرا**». واتە: بێگومان کاتێک إبن عباس ئەم قسانەی بیست لەبارەی قەدەر، گووتی: ئەمە یەکەم شیرکی

ئەم ئوممەتەیە، سوێند بە الله ئەم بیروڕایە خراپە وازیان لێناهێنێت تاکو بەتەواویی الله دەردەکەن لەوەی قەدەری چاکەی دانابێ هەروەکو چۆن وا دەریان کردووە لەوەی قەدەری خراپەکان دابنێت.

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: بێگومان لەم سەردەمە کەسانێکمان بینیوە کە -بۆ نموونە- لە ڕووداوێک ڕزگاری بووە یان نەخۆشییەکی کوشندەی هەبووە و دواتر چاک بووەتەوە، کاتێک پێی دەڵێی: سوپاسی الله بکە، ئەمە قەدەرێکی خێری الله یە. لەدڵی قورسە دانی پێدابنێ!، دەڵێ: ئاخر ئازایەتی خۆمی تێدابوو!، ئاخر دکتۆرەکە پسپۆڕ بوو!، ئاخر ئاخر ئاخر.. نازانێت "ئاخر" دەیکاتە "کافر".

**فأنتم تزعمون بجهلكم أن من كان في علم الله ضالا فاهتدى فهو بما ملك ذلك حتى كان في هداه ما لم يكن الله علمه فيه، وأن من شرح صدره للإسلام فهو بما فوض إليه قبل أن يشرحه الله له، وأنه إن كان مؤمنا فكفر فهو مما شاء لنفسه، وملك من ذلك لها، وكانت مشيئته في كفره أنفذ من مشيئة الله في إيمانه.**

---

قەدەرییەکان کۆڵ نادەن لە کوفر، دەڵێن: «**فأنتم تزعمون بجهلكم أن من كان في علم الله ضالا فاهتدى فهو بما ملك ذلك حتى كان في هداه ما لم يكن الله علمه فيه، وأن من شرح صدره للإسلام فهو بما فوض إليه قبل أن يشرحه الله له، وأنه إن كان مؤمنا فكفر فهو مما شاء لنفسه، وملك من ذلك لها، وكانت مشيئته في كفره أنفذ من مشيئة الله في إيمانه**». واتە: ئێوە بە جاهیلێتی خۆتان پێتان وایە کە ئەو کەسەی لە زانستی الله بە گومڕا تۆمار کرابێ و دواتریش هیدایەتی وەرگرت ئەوا بە هێز و بازووی خۆی هیدایەتی وەرگرتووە بەجۆرێک کە الله ئاگاداری نەبووە!. هەروەها ئەو کەسەی دڵی کراوەتەوە بۆ ئیسلام ئەوا بە ویستێک بووە لەپێش ئەوەی الله دڵی بکاتەوە بۆی!. هەروەها ئەگەر موسڵمان بێت و پاشان کافر ببێت ئەوا بە ویستی خۆی بووە بۆخۆی!، هەروەها توانای هەبووە بـــۆ

ئەم ویستە. بەمەش ئیتر ویستی خۆی چەسپا بەسەر ویستی الله بۆ ئیمانداربوونی!

**بل أشهد أنه من عمل حسنة فبغير معونة كانت من نفسه عليها، وأن من عمل سيئة فبغير حجة كانت له فيها، وأن الفضل بيد الله يؤتيه من يشاء، وأن لو أراد الله أن يهدي الناس جميعا لنفذ أمره فيمن ضل حتى يكون مهتديا، فقلتم: بمشيئته شاء لكم تفويض الحسنات إليكم، وتفويض السيئات، ألقى عنكم سابق علمه في أعمالكم، وجعل مشيئته تبعا لمشيئتكم.**

---

له وەڵامدا ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- پێیان دەڵێت: «**بل أشهد أنه من عمل حسنة فبغير معونة كانت من نفسه عليها، وأن من عمل سيئة فبغير حجة كانت له فيها، وأن الفضل بيد الله يؤتيه من يشاء، وأن لو أراد الله أن يهدي الناس جميعا لنفذ أمره فيمن ضل حتى يكون مهتديا**». واتە: بەڵكو شاهێدی دەدەم بەوەی هەر کەسێک کردەوەیەکی چاک بکات ئەوا بەبێ هاوکاریی نەفسی بووە. هەر کەسیش کردەوەیەکی خراپ بکات ئەوا بێ بەڵگە بووە. هەروەها فەزڵ لەدەست الله یە و دەیدات بە هەر کەسێک بیەوێت، ئەگەر الله ویستی لە هیدایەتی هەمووان بووایە ئەوا فەرمانەکەی جێبەجێ دەکرا بەسەر گومڕاکانیش تا هیدایەت وەردەگرن.

ئەو فێڵبازانە دەیانەوێت -بە حیسابی خۆیان- سەر لە ئەمیری موسڵمانان بشێوێنێنن بە گوفتارە شەیتانییەکانیان، هەروەک دەڵێن: «**فقلتم: بمشيئته شاء لكم تفويض الحسنات إليكم، وتفويض السيئات، ألقى عنكم سابق علمه في أعمالكم، وجعل مشيئته تبعا لمشيئتكم**». واتە: ئێوە (قەدەرییەکان) دەڵێن: بەڵێ کەواتە الله ویستی وابووە کە توانای ئەنجامدانی کردەوەی چاک و خراپەکان بداتە دەست خۆتان، بەمەش ویستی خۆی خستە دوای ویستی ئێوە!

**ويحكم فوالله ما أمضى لبني إسرائيل مشيئتهم حين أبوا أن يأخذوا ما آتاهم بقوة حتى نتق الجبل فوقهم كأنه ظلة، فهل رأيتموه أمضى مشيئته لمن كان في ضلالته حين أراد هداه حتى صار إلى أن أدخله بالسيف إلى الإسلام كرها بموضع علمه بذلك فيه.**

---

ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- بە توڕەییی وەڵامیان دەداتەوە و بەڵگەیان بۆ دێنێتەوە؛ تاکو بیسەلمێنێت ئەگەر الله ویستی لە شتێک بێت ئەوا ویستی مرۆڤەکان نابنە بەربەست: «**ويحكم فوالله ما أمضى لبني إسرائيل مشيئتهم حين أبوا أن يأخذوا ما آتاهم بقوة حتى نتق الجبل فوقهم كأنه ظلة**». واتە: داوەشێن، سوێند بە الله خواستی نەوەکانی ئیسڕائیل جێبەجێ نەبوو کاتێک ڕەتیانکردەوە تەوڕاتەکەیان بە توندیی بگرن (واتە پابەندی بن)، تاکو الله وایکرد چیایەکە (طور) لەسەریان بووەستێت هەروەک سێبەر.

هەروەها دەڵێت: «**فهل رأيتموه أمضى مشيئته لمن كان في ضلالته حين أراد هداه حتى صار إلى أن أدخله بالسيف إلى الإسلام كرها بموضع علمه بذلك فيه**». واتە: ئایا بینیوتانە چۆن الله ویستی هیدایەتی جێبەجێ کردووە بۆ کەسێکی گومڕا؟، بەجۆرێک کە وای لێکرد بە زەبری شمشێر ببێتە موسڵمان! دەیشیزانی ئەمەی لەدڵ گرانە.

**أم هل أمضى لقوم يونس مشيئتهم حين أبوا أن يؤمنوا حتى أظلهم العذاب فآمنوا وقبل منهم، ورد على غيرهم الإيمان، فلم يقبل منهم، وقال تعالى: {فلما رأوا بأسنا قالوا آمنا بالله وحده وكفرنا بما كنا به مشركين * فلم يك ينفعهم إيمانهم لما رأوا بأسنا سنة الله التي قد خلت في عباده}[١]. أي علم الله الذي قد خلا في خلقه: {وخسر هنالك الكافرون}[٢].**

---

ئەوجارەیان ئەمیری موسڵمانان باسی هەندێک قەوم دەکات کە لەکاتی هاتنی سزا تەوبەیان کردووە و لێیان قەبوڵ کراوە بە ویستی الله، هەندێک قەومی تریش بەهەمان شێوە لەکاتی سزا تەوبەیان کردووە بەڵام لێیان قەبوڵ نەکرا.

هەروەک دەڵێت: «**أم هل أمضى لقوم يونس مشيئتهم حين أبوا أن يؤمنوا حتى أظلهم العذاب فآمنوا وقبل منهم، ورد على غيرهم الإيمان، فلم يقبل منهم، وقال تعالى: {فلما رأوا بأسنا قالوا آمنا بالله وحده وكفرنا بما كنا به مشركين * فلم يك ينفعهم إيمانهم لما رأوا بأسنا سنة الله التي قد خلت في عباده}. أي علم الله الذي قد خلا فـــي خلقه: {وخسر هنالك**

---

(١)(٢) سورەتی غافر، ئایەی ٨٤ و ٨٥.

**الكافرون}**». واتە: ئایا خواستی قەومی یونس جێبەجێ بوو؟! کاتێک ئیمانیان ڕەتکردەوە و بەڵام لەکاتی نزیک بوونەوەی سزادا ئیمانیان هێنا و لێیان قەبوڵ کرا. هەروەها هەمان حاڵەتیش بەسەر قەومی تر هات بەڵام تەوبەیان لێ قەبوڵ نەکرا. هەروەک الله -تعالی- گووتی: {**کاتێک سزا و زەبری ئێمەیان بینی، گووتیان: ئیمانمان هێنا بە الله بەتەنیا هەروەها کافرین بەوانەی کە پێیان موشریک ببووین * لەوکاتە ئیمانەکەیان سوودی بۆیان نەبوو لەوکاتەی سزای ئێمەیان بینی، ئەمەش سوننەتی الله یە لە مامەڵەی عەبدەکانی**}. مـەبەستیش لە "**سنة**" بریتییە لە زانستی الله کەوا لەسەر دروستکراوانی جێبەجێ بوو. کە بریتی بوو لە تیاچوون و مردنی قەومەکە بە کافرێتیی، هەروەک فەرمووی: {**لەوێدا کافران زەرەریان کرد**}.

**وذلك كان موقعهم عنده أن يهلكوا بغير قبول منهم بل الهدى والضلالة والكفر والإيمان والخير والشر بيد الله يهدي من يشاء ويذر من يشاء في طغيانهم يعمهون.**

---

ئینجا ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- دەڵێت: «**وذلك كان موقعهم عنده أن يهلكوا بغير قبول منهم بل الهدى والضلالة والكفر والإيمان والخير والشر بيد الله يهدي من يشاء ويذر من يشاء في طغيانهم يعمهون**». واتە: ئەمەش چونکە لەلای الله تۆمارکرابوون بەوەی لەناو بچن بەبێ ئەوەی ئیمانیان لێ قەبوڵ بکرێت، ئەسڵەن هیدایەت و گومڕایی و کوفر و ئیمان و خێر و شەڕ لەدەستی الله یە، هیدایەتی هەر کەس دەدات کە بیەوێ، هەر کەسێکیش جێدێڵێ لەناو گومڕایی ئەگەر ویستی لێبێ.

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: لەوانەیە خوێنەر بپرسێت: بەڵگە چییە کە قەومی یونس -علیه السلام- لەکاتی سزادا ئیمانیان هێنا و لێیان قەبوڵ کرا؟

لە وەڵامدا دەڵێم: پەروەردگار -عز وجل- فەرموویەتی: **{فلولا كانت قرية ءامنت فنفعها إيمانها إلا قوم يونس لما ءامنوا كشفنا عنهم عذاب الخزي في الحياة الدنيا ومتعناهم**

**إلی حين}**[1]. واتە: **{دەی با ناوچەیەک ئیمانیان بهێنایە و ئیمانەکەش سوودی بۆیان هەبووایە (واتە شتی وا نەبووە) تەنها قەومی یونس نەبێ کاتێک ئیمانیان هێنا ئەوا سزای سەرشۆڕیمان لەسەریان لابرد لە ژیانی دونیا، هەروەها بۆ ماوەیەک لە نیعمەتەکان ژیاندمان}.**

(١) سورەتی یونس، ئایەی ٩٨.

**كذلك قال إبراهيم عليه السلام: {واجنبني وبني أن نعبد الأصنام}[1]. وقال عليه السلام: {ربنا واجعلنا مسلمين لك ومن ذريتنا أمة مسلمة لك}[2]. أي أن الإيمان والإسلام بيدك، وإن عبادة من عبد الأصنام بيدك، فأنكرتم ذلك وجعلتموه ملكا بأيديكم دون مشيئة الله عز وجل.**

---

ئەوجارەیان ئەمیری موسڵمانان بەڵگەیەکی زۆر وازح دەهێنێتەوە بۆ قەدەرییە مەجوسەکان، ئەویش بریتییە لە دوعای پێغەمبەر إبراهیم -علیه السلام-، هەروەک نووسراوە: «**كذلك قال إبراهيم عليه السلام: {واجنبني وبني أن نعبد الأصنام}. وقال عليه السلام: {ربنا واجعلنا مسلمين لك ومن ذريتنا أمة مسلمة لك}. أي أن الإيمان والإسلام بيدك، وإن عبادة من عبد الأصنام بيدك، فأنكرتم ذلك وجعلتموه ملكا بأيديكم دون مشيئة الله عز وجل**».

واتە: هەروەک إبراهیم -علیه السلام- فەرمووی: **{من و کوڕەکەم بەدوور بگرە لەوەی بەندایەتی بتەکان بکەین}**. هەروەها فەرمووی: **{ئەی پەروەردگارمان، وامان لێبکە ملکەچ و تەسلیمی تۆ بین، هەروەها لە نەوەکانی ئێمەدا ئوممەتێکی موسڵمان و ملکەچی خۆت دروستبکە}**. کـەواتە ئیمـان و

---

(١) سورەتی إبراهیم، ئایەی ٣٥.

(٢) سورەتی البقرة، ئایەی ١٢٨.

ئیسلام لەدەستی الله یە، هەروەها پەرستنی بتەکانیش هەر لە دەستی الله یە، کەچی ئێوە (قەدەرییەکان) ڕەتی دەکەنەوە و پێتان وایە لەدەستی خۆتانە نەک الله، -عز وجل!

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە؛ چونکە پێغەمبەر إبراهیم سەرەڕای ئەوەی کەسێکی موەحید بوو، هەروەها دژی بتپەرستیی بوو، لەگەڵ ئەمەش هێشتا دوعای دەکرد و دەیگووت خوایە خۆم و کوڕەکەم بپارێزە لە بتپەرستیی! ئەمە دەیسەلمێنێت هیدایەت و گومڕایی بە ویستی الله یە، نەک مرۆڤ.

**وقلتم في القتل أنه بغير أجل وقد سماه الله لكم في كتابه فقال ليحيى: {وسلام عليه يوم ولد ويوم يموت ويوم يبعث حيا}[1]. فلم يمت يحيى إلا بالقتل وهو موت كما مات من قتل منهم شهيدا، أو قتل عمدا، أو قتل خطأ، كمن مات بمرض، أو فجأة، كل ذلك موت بأجل توفاه، ورزق استكمله، وأثر بلغه، ومضجع برز إليه: {وما كان لنفس أن تموت إلا بإذن الله كتابا مؤجلا}[2]. ولا تموت نفس ولها في الدنيا عمر ساعة إلا بلغته، ولا موضع قدم إلا وطئته، ولا مثقال حبة من رزق إلا استكملته، ولا مضجع بحيث كان إلا برزت إليه.**

---

ئەوجارەیان قەدەرییەکان ویستوویانە لە باسی "مردن" شوبهە دروست بکەن، گووتوویانە: مردن کاتی نادیارە (واتە لەلای الله ش نادیارە!)، ئەویش لە وەڵامدا بەبەڵگەی ئایەت پێیان دەڵێت: «**{وما كان لنفس أن تموت إلا بإذن الله كتابا مؤجلا}**». واتە: **{هیچ نەفسێک بۆی نییە بمرێت تەنها بە ئیزنی الله نەبێت، ئەمەش بە نووسراوێکی دیاریکراو (واتە کاتی مردنەکەی زانراوە)}**.

---

(١) سوڕەتی مریم، ئایەی ١٥.

(٢) سوڕەتی آل عمران، ئایەی ١٤٥.

هەروەها نموونە بە حاڵی پێغەمبەر یەحیا دێنێتەوە -علیه السلام- کەوا ئەم پێغەمبەرە بەدەستی جولەکەکان شەهید کرا، هەروەک فەرموویەتی: «**فقال ليحيى: {وسلام عليه يوم ولد ويوم يموت ويوم يبعث حيا}. فلم يمت يحيى إلا بالقتل وهو موت**». واتە: الله لەبارەی یەحیا فەرمووی: {**سەلامی لەسەر بێت لەو ڕۆژەی لە دایکبوو و لەو ڕۆژەی دەمرێت و لەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێتەوە**}، لەگەڵ ئەوەشدا یەحیا بە مردنی خۆی نەمرد، بەڵکو کوژرا، ئەمەش جۆرێکە لە مردن.

هەروەها ئەمیری موسڵمانان دەڵێت: «**ولا تموت نفس ولها في الدنيا عمر ساعة إلا بلغته، ولا موضع قدم إلا وطئته، ولا مثقال حبة من رزق إلا استكملته، ولا مضجع بحيث كان إلا برزت إليه**». واتە: هیچ نەفسێک نامرێت کەوا لە ژیانی دونیادا تەمەنی کاژێرێکی مابێت ئیللا دەبێت کاژێرەکەش تێپەڕێنێت، هەروەها ئەگەر تەمەنی ڕۆیشتنی یەک شوێنپێی مابێت ئیللا دەبێت بڕوات، هەروەها ئەگەر تەمەنی گەیشتنی هەبێت بە شوێنێک ئەوا ئیللا دەبێ بیگاتێ.

**يصدق ذلك قول الله عز وجل: {قل للذين كفروا ستغلبون وتحشرون إلى جهنم}[1]. فأخبر الله سبحانه بعذابهم بالقتل في الدنيا والآخرة بالنار، وهم أحياء بمكة.**

---

ئینجا ئەمیری موسڵمانان بەڵگەیان بۆ دێنێتەوە کە چۆن هەر لە ژیانی دونیادا الله هەواڵی دایە موشریکەکان بەوەی لە دونیا شکست دەهێنن و لە دواڕۆژیش شوێنیان ئاگرە! هەروەک دەڵێت: «**یصدق ذلك قول الله عز وجل: {قل للذين كفروا ستغلبون وتحشرون إلى جهنم}. فأخبر الله سبحانه بعذابهم بالقتل في الدنيا والآخرة بالنار، وهم أحياء بمكة**».

واتە: سەلمێنەری ئەو قسەیەش بریتییە لە گوفتاری الله -عز وجل- کە دەڵێت: {**-ئەی محمد- بە کافران بڵێ: ئێوە شکست دەهێنن (لە دونیا) هەروەها کۆدەکرێنەوە بەرەو دۆزەخ (لە دواڕۆژ)**}. ئەوەتا الله ڕایگەیاند لە ژیانی دونیادا سزایان دەدات بەوەی دەکوژرێن، لە دواڕۆژیش سزایان دەدات بە ئاگر. کەچی ئەوان لەکاتی دابەزینی ئایەتەکەدا لەژیان بوون لە مەککە!

---

(١) سورەتی آل عمران، ئایەی ١٢.

**وتقولون أنتم أنهم قد كانوا ملكوا رد علم الله في العذابين اللذين أخبر الله ورسوله أنهما نازلان بهم، وقال تعالى: {ثاني عطفه ليضل عن سبيل الله له في الدنيا خزي}[1]. يعني القتل يوم بدر، {ونذيقه يوم القيامة عذاب الحريق}[2]، فانظروا إلى ما أرداكم فيه رأيكم وكتابا سبق في علمه بشقائكم إن لم يرحمكم.**

---

قەدەرییەکانیش بەردەوامن لەسەر شیرکیان، هەروەک گووتوویانە: «**{وتقولون أنتم أنهم قد كانوا ملكوا رد علم الله في العذابين اللذين أخبر الله ورسوله أنهما نازلان بهم**». واتە: ئێوە دەڵێن: کافرانی مەککە دەیانتوانی ئەو زانینەی الله ڕەت بکەنەوە و نەهێڵن لە دونیادا بکوژرێن و لە دواڕۆژیش سزا بدرێن!

ئەمیری موسڵمانان وەڵامیان دەداتەوە: «**وقال تعالى: {ثاني عطفه ليضل عن سبيل الله له في الدنيا خزي}. يعني القتل يوم بدر، {ونذيقه يوم القيامة عذاب الحريق}**». واتە: الله -تعالى- گووتوویەتی: **{ڕووی خۆی وەردەگێڕێ بۆ ئەوەی خۆی گومڕا بکات لە ڕێگای الله (ڕێگای ڕاست)، لە دونیا سەرشۆڕیی بۆ دەبێت}**. مەبەستیش لە "**خزي**" بریتییە لە

---

(١)(٢) سورەتی الحج، ئایەی ٩.

.............................................

کوشتنی کافرەکانی غەزوەی "بدر"، هەروەها دەڵێت: **{لە قیامەتیشدا سزای ئاگری پێ دەچێژین}**.

**ثم قول رسول الله صلى الله عليه وسلم: «بني الإسلام على ثلاثة أعمال: الجهاد ماض منذ يوم بعث الله رسوله إلى القيامة، فيه عصابة من المؤمنين يقاتلون الدجال لا ينقض ذلك جور جائر ولا عدل من عدل، والثانية: أهل التوحيد لا تكفروهم ولا تشهدوا عليهم بشرك، والثالثة: المقادير كلها خيرها وشرها من قدر الله»**[1].

---

ئینجا ئەمیری موسڵمانان فەرموودەیەکی پێغەمبەر -علیه السلام- دەهێنێتەوە، هەروەک دەڵێت: «**بني الإسلام على ثلاثة أعمال: الجهاد ماض منذ يوم بعث الله رسوله إلى القيامة، فيه عصابة من المؤمنين يقاتلون الدجال لا ينقض ذلك جور جائر ولا عدل من عدل، والثانية: أهل التوحيد لا تكفروهم ولا تشهدوا عليهم بشرك، والثالثة: المقادير كلها خيرها وشرها من قدر الله**». واتە: ئیسلام لەسەر سێ کردەوە دامەزراوە: (یەکەم:) لەو ڕۆژەی الله نێردراوی خۆی نارد تاکو قیامەت جیهادکردن بەردەوامە، کۆمەڵێک چەکداری ئیماندار کوشتاری دەجال دەکەن، هیچ شتێک جیهاد هەڵناوەشێنێ، نە ستەمی ستەمکار، نە دادپەروەریی دادپەروەر. (دووەم:) ئەهلی تەوحید تەکفیر مەکەن و پێیان مەڵێن موشریک.

(١) کتێبی المعجم الأوسط > باب العين > من إسمه: عبدالرحمن > فەرموودەی ژمارە: ٤٧٧٥.

(سێیەم:) هەموو قەدەرەکان بە خێر و شەڕیانەوە لەلایەن الله دارێژراون.

من (عبدالإله عبدالعدل) دەڵێم: ئیمامی الهیثمي -رحمه الله- لەبارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: "فيه إسماعيل بن يحيى التيمي، كان يضع الحديث"[1]. واتە: لە سەنەدی ئەم فەرموودەیە کەسێکی تێدایە بەناوی "إسماعيل بن يحيى التيمي" کە فەرموودەی هەڵدەبەست!

(١) کتێبی معجم الزوائد ومنبع الفوائد > كتاب الإيمان > باب لا يكفر أحد من أهل القبلة بذنب > فەرموودەی ژمارە: ٤٠٤.

**فنقضتم من الإسلام جهاده، ونقضتم شهادتكم على أمتكم بالكفر وبرئتم منهم ببدعتكم، وكذبتم بالمقادير كلها والآجال والأعمال والأرزاق، فما بقيت في أيديكم خصلة ينبني الإسلام عليها إلا نقضتموها وخرجتم منها.**

---

ئینجا ئەمیری موسڵمانان فەرموودەکە بەراورد دەکات بە قەدەرییەکان، هەروەک پێیان دەڵێت: «**فنقضتم من الإسلام جهاده، ونقضتم شهادتكم على أمتكم بالكفر وبرئتم منهم ببدعتكم، وكذبتم بالمقادير كلها والآجال والأعمال والأرزاق، فما بقيت في أيديكم خصلة ينبني الإسلام عليها إلا نقضتموها وخرجتم منها**». واتە: کەچی ئێوە (قەدەرییەکان) بەتەواویی جیهادتان لە ئیسلام ڕەت کردەوە. هەروەها شایەتیدانی سەر ئوممەتەکەتان هەڵوەشاندەوە و بەڕائەتتان لێیان کرد بەهۆی بیدعەکەتان. هەروەها هەموو قەدەریشتان ڕەت کردەوە لەگەڵ ئەجەل و کردەوە و ڕزقیش! ئیتر هیچ کامێک لەو سێ بنچینەیەتان تێدا نەماوە کە ئیسلامیان لەسەر دامەزرا، لە هەمووی دەرچوون و هەڵتانوەشاندەوە، -پەنا بە الله.

## ئەنجام و سوودەکانی ئەم پەیامە

پەیامەکەی ئەمیری موسڵمانان -رضي الله عنه- کۆمەڵێک سوودی تێدابوو لە ڕووی بیروباوەڕی قەزا و قەدەر، پەیامێکی دەوڵەمەند بوو بە بەڵگەی ئایات و فەرموودە. بەڵام نەمانبینی قەدەرییەکان یەک دانە بەڵگەش بهێنن بۆ سەلماندنی شوبهەکانیان!

هەمیشە حاڵی ئەهلی بیدەع ئاوایە بەهەموو جۆرەکانیان، قسەکانیان بەرهەمی دڵ و مێشکە بچووکەکەیانە، هیچ بەڵگەیەکیان نەبووە و نییە و نابێ.

جا بۆ ئەوەی خوێنەرە حەق خوازەکان زۆرتر لەم پەیامە تێبگەن، لەم بەشەدا تێکڕای سوودەکانی پەیامەکەم نووسیوە بەشێوەی خاڵ، هەروەها کوفرەکانی قەدەرییەکانیشم داناوە؛ تاکو خوێنەری حەق خواز بیخوێنێتەوە و وریابێت و بزانێت ئەم عەقیدەیە کوفرە.

**سوودەکانی پەیامەکە ئەمانەن:**

**١-** باوەڕمان وایە: یەکێک لە پایەکانی ئیمان بریتییە لە باوەڕبوون بە قەزا و قەدەر، پێویستە ئیمانمان پێی هەبێ و ملکەچی ببین، هەر کەسێکیش ڕەتی بکاتەوە ئەوا کافرە.

**٢-** باوەڕمان وایە: قەدەری الله هەر هەموو شتێکی ئەم گەردوونەی لەخۆ گرتووە و باسی کردووە، هیچ شتێک بوونی نییە لەم گەردوونەدا کە لە قەدەری الله تۆمار نەکرابێت.

**٣-** باوەڕمان وایە: لە قەدەری الله باسی هەموو کردەوەیەک کراوە، بە چاک و خراپەوە، بە خێر و شەڕەوە. بەڵام الله تەنها فەرمانی بە خێر کردووە، خراپە و شەڕیش بەرهەمی دڵی پیسی مرۆڤەکانە بە هاوکاریی شەیتان.(١)

**٤-** پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- باسی قەدەرییەکانی کردووە و تەکفیری کردوون و بە "مەجوس" وەسفی کردوون؛ ئەمەش چونکە قەدەرییەکان دەڵێن: لە قەدەری الله تەنها کردەوەی چاک تۆمار کراوە، الله ئاگاداری کردەوە خراپەکان نییە بەڵکو خۆمان بەرهەمی دەهێنین بەبێ زانستی الله! بەمەش

---

(١) بگەڕێوە بۆ لاپەڕەی ژمارە: ٨٢ تا ٨٥.

وەک مەجوسییەکان خودای خێر و خودای شەڕیان دروست کرد!!![1]

٥- باوەڕمان وایە: الله لە ڕابردووەوە هەموو شتێکی تۆمار کردووە و دەزانێت لە داهاتوودا عەبدەکانی چی دەکەن و چارەنووسیان چۆن دەبێت. ئەوەیشی ئەم حەقیقەتە ڕەت بکاتەوە ئەوا قەدەرییە.[2]

٦- باوەڕمان وایە: توانای زانینی الله بەجۆرێک فراوانە کە دەزانێت لە داهاتوو چی ڕوودەدات ئەگەرچی هێشتا هیچ ڕووی نەدابێت.[3]

٧- باوەڕمان وایە: ویستی الله دەکەوێتە پێش ویستی مرۆڤەکان، هەر مرۆڤێک ئەگەر ویستێکی بۆ دروست ببێت ئەوا ئیللا پێشوەختە الله خستوویەتیە دڵی.[4]

٨- یەکێک لە درۆ و کوفری قەدەرییە مەجوسییەکان ئەوەیە کە دەڵێن: مرۆڤ دەتوانێت تاوانێک بکات ئەگەرچی لە قەدەری الله ڕێگریی لێکرابێت! هەروەها دەتوانێ عیبادەت بکات ئەگەرچی لە قەدەری الله ڕێگریی لێکرابێت! یاخود

---

(١) بگەڕێوە بۆ لاپەڕەی ژمارە: ١٦.

(٢) بگەڕێوە بۆ لاپەڕەی ژمارە: ٢١.

(٣) بگەڕێوە بۆ لاپەڕەی ژمارە: ٢٢ و ٢٣.

(٤) بگەڕێوە بۆ لاپەڕەی ژمارە: ٢٣ تا ٢٧.

دەتوانێت خۆی بکات بە ئەهلی بەهەشت ئەگەرچی لە قەدەری الله شوێنی ئاگر بێت! یاخود بە پێچەوانەوە... کەواتە پێیان وایە مرۆڤ دەتوانێت بە پێچەوانەی قەدەری الله بووەستێت.(١)

**٩**- باوەڕمان وایە: مرۆڤەکان ئەو قەدەرە جێبەجێ دەکەن کە الله بۆی داناون، هیچ کەسێک و شتێک ناتوانێت ببێتە بەربەست و ڕێگر لەبەردەم جێبەجێ بوونی قەدەری مرۆڤەکان.

**١٠**- یەکێکی تر لە کوفری قەدەرییە مەجوسییەکان ئەوەیە کە دەڵێن: ئەگەر الله بیەوێت ئەوا دەتوانێت هەواڵەکانی ناو قورئان بگۆڕێت بۆ هەر شتێک کە خۆی ویستی لێبێت!

**١١**- باوەڕمان وایە: الله لەپێش دروستکردنی مرۆڤایەتی هەموو قەدەرێکی دانا و یەکلای کردەوە و کۆتایی پێهێنا، هەموو ڕووداو و شتێکی ئەم گەردوونەی تێدا تۆمار کراوە هەر لەوکاتەوە تاکو کۆتایی.

**١٢**- یەکێکی تر لە کوفری قەدەرییەکان ئەوەیە کە دەڵێن: نەخێر الله ئەوکات قەدەری دانەنابوو و کۆتایی پێ نەهاتووە بەڵکو بەردەوامە لە نووسینی قەدەر!

---

(١) بگەڕێوە بۆ لاپەڕەی ژمارە: ٩١ تا ١٠٦.

